رۆمان




سێ
رۆژی
کۆتایی
فێرناندۆ پێسەوا

# وڕێنە

ئەنتۆنیۆ تابۆکی

وەرگێڕانی عەتا محەمەد



## سێ ڕۆژی کۆتایی فێرناندۆ پێسەوا

# وڕێنە




### ئەنتۆنیۆ تابوکی

وەرگێڕانی **عەتا محەمەد**




ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: وڕێنە: سێ ڕۆژی کۆتایی فێرناندۆ پێسەوا
ناوی نووسەر: ئەنتۆنیۆ تابوکی
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عەتا محەمەد
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٤٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٥٤٤)ـی ساڵی (٢٠١٤)ـی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-979-7

ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی

هذیان: أیام فرناندو بیسووا الثلاثة الأخیرة
أنطونیو تابوکی، ترجمة: أسکندر حبش، ١٩٩٧

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# پێڕست

# پێشەکی
# لەبەرگرتنەوەی کتێب

(...خوای گەورە ڕەحمیان پێ بکات،کەی ئیبن بەتریق،
ئیبن ناعمە، ئیبن قەررە (...)و ئیبن ئەلموقەفەع
وەک ئەرستۆ بوون؟ کەی خالید (کوڕی یەزید کوڕی معاویە)
وەک ئەفلاتون بووە؟)
جاحظ- کتاب الحیوان

پێش هەر شتێک دەبێت ئەو تکایە بکەم، ئەگەر پێسەوا بە باشی ناناسیت، ئەوا باشترە ئەم ڕۆمانە نەخوێنیتەوە. چونکە هیچ جوانییەکی نابێت لەلات و ئەوەی ئەم ڕۆمانە دەیڵێت، بەشێکی دەکەوێتە دەرەوەی خۆیەوە، کە ژیانی فێرنانادۆ پێسەوا خۆی و کەسایەتییە دروستکراوەکانییەتی. ئاشنایەتیش بە تابوکی، تا ڕادەیەک بایەخی خۆی هەیە. کە من کاتێک لە ٢٠١٣دا گۆشەیەکم لە ڕەخنەی چاودێر هەبوو، لەژێر ناوی (یادی پیاوێک، کە ٧٢ سێبەری هەبوو) هەوڵمدابوو کەمێک لەبارەی ئەفسانەی پێسەواوە بدوێم. هەرچۆن لە بەشێکی کتێبی (پەراوێزنووسان)یشدا لەبارەی ئەنتۆنیۆ تابوکییەوە نووسیومە.

***

ئەمە یەکەم جارە هەوڵی وەرگێڕانی کتێبێک بدەم، ئەویش ئەم ڕۆمانە بچوکەی ئەنتۆنیۆ تابوکیی ڕۆماننووسی ئیتالییە. با ئەو ڕایە فەرامۆش نەکەین، کە پێی وایە وەرگێڕان بریتییە لە نووسینەوەی دەقێک بە زمانێکی تر، یاخود لە زمانێکی تردا. بەڵام وەرگێڕان بریتی نییە لە کۆپی کردنی دەقێک لە زمانێکی تردا، یاخود لەبەرگرتنەوەی دەقێک بە زمانێکی تر. لەبەر ئەوەی هەر زمانێک تایبەتمەندیی خۆی هەیە چ لە ئاستی دەنگ، چ لە ئاستی مانا و ڕێزمانیشدا. هەربۆیە ئەو وتەیەی جاحظ (١٥٩-٢٥٥ی کۆچی)م هێناوەتەوە، کە لەو سەردەمەدا باسی کاری ئەو وەرگێڕانە دەکات، کە ڕاستەوخۆ لە یۆنانی و هیندی و فارسییەوە ئەدەب و فەلسەفە و زانستی ئەو سەردەمەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و دەپرسێت: کەی وەک ئەسڵەکە وان؟ لێرەدا ئەو چیرۆکەی بۆرخیسم دێتەوە یاد (گەڕانی ئیبن ڕوشد)، کە باس لەوە دەکات کاتێک ئیبن ڕوشد بەشی یانزە لە کتێبی (تهافت التهافت) لە دژی کتێبەکەی غەزالی (تهافت الفلاسفة) دەنووسێت، بەوپێیەی یۆنانی و سریانی نازانێت، لە ڕێگای (وەرگێڕانی وەرگێڕانێکەوە) بەر هەردوو وشەی (تراژیدیا و کۆمیدیا) دەکەوێت، کە لە زمانی عەرەبیدا نین، چونکە پەیوەندییان بە هونەرێکەوە هەیە، کە شانۆیە و ئەم هونەرەش لە کولتووری عەرەبی و ئیسلامیدا نییە. دیارە زۆرێک لە چیرۆکەکانی بۆرخیس بە کەڵکی گێڕانەوە نایەن و باشترە خوێنەر خۆی هەوڵی خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە بدات. ئیبن ڕوشد لەو چیرۆکەدا تووشی ئەو وشانە دەبێت، کە لەزمانەکەی خۆیدا بەرانبەریان نییە (بەوپێیەی هونەری شانۆ بوونی نییە) هەربۆیە دەبێت بەرانبەریان بۆ دابنێت. کە ئەمە یەکێکە لە گرفتەکانی وەرگێڕان. گرفتی دووەم گواستنەوەی مانای دەقەکەیە

بۆ زمانێکی تر.

من لێرەدا هەستدەکەم زیاتر هەوڵمداوە دەقەکە بگوێزمەوە بۆ کوردی، نەوەک سەرلەنوێ نووسینەوەی ئەم ڕۆمانە بە کوردی. چونکە من وەک نووسەرێکی تری دەقەکە (ئەگەر ئەم گوزارشتە گونجاو بێت بۆ وەرگێڕ) جگە لە زیادکردنی هەندێک پەراوێز، هەوڵم نەداوە لە سنووری دەقەکە دەربچم و وەک نووسەرەوەیەکی تری دەقەکە، ئەو شتانە بنووسمەوە، کە لە ئەندێشەمدان، ئەگەر هاتوو من ئەم ڕۆمانەم بنووسیایە یاخود بنووسیایەتەوە.

***

ئەم ڕۆمانە، ساڵی ١٩٩٤ وەرگێڕانە فەرەنسییەکەی لە خانەی لۆسوی فەرەنسا، پێش ئیتالییەکەی بڵاودەکرێتەوە و منیش هەوڵمدا لەسەر ئەو وەرگێڕانەی ئەسکەندەر حەبەش وەری بگێڕم بۆ کوردی، کە لە فەڕەنسییەوە کردویەتی و ساڵی ١٩٩٧ بڵاوی کردۆتەوە و ٧٦ لاپەڕەیە، نەوەک لەسەر ئەو چاپەی ٢٠١٣ە، کە ١٢٦ لاپەڕەیە، بەوەی لەم چاپەیاندا، حەبەش پێشەکییەکی درێژی ٥٠ لاپەڕەیی بۆ کتێبەکە زیادکردووە و من ئەم نوسخەیانم دەستنەکەوتووە.

***

هەر کتێبێک چیرۆکی خۆی هەیە، منیش دەمەوێت چیرۆکی خۆم لەگەڵ ئەم کتێبەدا بگێڕمەوە، کە سەرئەنجام ناچاربووم لە زمانی سێیەمەوە هەوڵبدەم بیکەم بە کوردی. ئەگەرچی من دەزانم قسە لە وەرگێڕان دەکرێت لە زمانی یەکەمەوە. بەڵام من نە زمانی یەکەمی ئەم ڕۆمانە دەزانم، نە زمانی دووەمی، دەشمویست خوێنەرانێک لەگەڵمدا ئەم ڕۆمانە بچوکە بخوێننەوە. بەڵام متمانە بوون بە وەرگێڕێکی وەک ئەسکەندەر حەبەش (کە

دواتر تووشی گومان بووم)، پاڵنەرێک بوو بۆئەوەی جورئەتی کارێکی وا بکەم، (پاشان پاڵنەرێکی تر ئەوەبوو شوان ئەحمەدی هاوڕێم، کە ئاشنایەتییەکی زۆری لەگەڵ دنیای پێسەوادا هەیە، ئامادەیی خۆی دەربڕی کۆمەکم بکات و بە دەقەکەدا بچێتەوە، کە هەرواشی کرد). چاپێکی دیکەی ئەم ڕۆمانە، کە لەبەردەستمدا بووبێت، ئیسپانییەکەی بوو، کە من تەنها یەک وشە لەو زمانە نازانم. لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو نوسخەکەم دانا و لە هەندێک لایەنەوە بەراوردم کردن. بینیم لە ئیسپانییەکەدا، فەسڵەکان تەنها ژمارەیان هەیە و وەک نوسخەکەی ئەسکەندەر حەبەش ناونیشانیان نییە. کە بەلای منەوە کارەکەی حەبەش جوانترە. پاشان حەبەش هەستاوە بە زیادکردنی بەشێک، کە ژیاننامەی تابوکی و ئەو کەسانەی بە کورتی نووسیوەتەوە، کە لەم ڕۆمانەدا ناویان هاتووە، ئەمەش لە ئیسپانییەکەدا نەبوو. منیش لەم بەشەدا زۆر پەیوەست نەبووم بە دەقەکەی ئەسکەندەر حەبەشەوە و خۆم هەندێک زیاتر لەوەی ئەوم نووسیوە تا زیاتر کۆمەکی خوێنەر بکات. پاشان لەلایەنی نەخشەسازییەوە، حەبەش سکێچەکانی (خۆلیۆ پومار)ی لەم کتێبەدا داناوە، کە لە ئیسپانییەکەدا نییە و من بەلامەوە جوان بوون.

شتێک کە حەزدەکەم باسی بکەم ئەوەیە، لە سێ دێڕدا گرفتم لە تێگەشتنیان هەبوو، ناچار ناونیشانی ئەسکەندەر حەبەشم دۆزییەوە و ئەوەم پێوت، ئەویش بە چەند وشەیەک وەڵامی دامەوە، کە بۆی بنێرم. ئەوەبوو بەنامەیەکی کورت بۆم نارد و ئیدی وەڵامی نەبوو. ناچار من لەسەر نوسخە ئیسپانییەکە (کە یەک وشەی لێ نازانم) بەدوایاندا گەڕام و دۆزیمنەوە. یەکێک لەو شتە سەیرانە ئەو فەسڵەیە بەناوی (ڕەچەتەی

ڕۆبیانی عەرەقکردوو)وەوەیە. لە عەرەبییەکەدا ناوی (ڕەچەتەی کەرکەدەنی عەرەقکردوو)ە. بەڵام من هەرچەند دەمخوێندەوە هیچ ئاماژەیەکم نەدەبینی بۆ گۆشتی کەرکەدەن، بەڵکو باسی خواردنی ئاژەڵە توێکڵدارەکانی دەکرد. منیش بۆ حەبەشم نووسی بوو، ئایا ئاژەڵێکی دەریایی هەیە بەناوی کەرکەدەنەوە؟ بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە و خۆشم چەند گەڕام شتێکی وام نەبینی. ناچار لەو فەسڵەدا، بە زمانێکدا دەگەڕام کە هیچی لێ نازانم و ئیسپانییە، تا ئەو وشەیەم دۆزییەوە و لەڕێگای فەرهەنگ و گۆگڵەوە زانیم مەبەستی ڕۆبیانە، چونکە لەگەڵ وشەکەدا وێنەی ڕۆبیانی دەهێنا و ئەمەش لەگەڵ ڕەچەتەی خواردنەکەدا دەگونجا. ئەمەش تووشی گومانی کردم. بەڵام ئەمە کاتێک بوو کە من کارەکەم تەواو کردبوو.

***

ساڵانێک پێش مەرگی تابوکی، من ئەم ڕۆمانەم خوێندبووەوە، ڕۆژی دوای ئەوەی لە ٢٥ی ئازاری ٢٠١٢ مرد، خۆبەخۆ من ئەم ڕۆمانەیم بۆ جاری دووەم خوێندەوە، چونکە تەنها شت بوو لە دەستم دەهات بۆ مردنەکەی. خۆشەویستی من بۆ ڕۆمانەکانی تابوکی، دەگەڕێتەوە بۆ سەرسامیم بە پێسەوا و تابوکییش بە یەکێک لە پێسەوا مەزنەکان دادەنرێت لە جیهاندا. پاشان ئەو کورت نووسییەی لەم ڕۆمانەدا هەیە، مایەی سەرسامیمە و لەو باوەڕەدام کورت ترین ڕۆمان بێت، تا ئێستا خوێندبێتمەوە.

ئەم ڕۆمانە کورتە و نامەوێت هیچی لەبارەوە بڵێم، چونکە ئەوکاتە پاساوی خوێندنەوەی کەم دەبێتەوە. بەڵام دەمەوێت دوو تێبینی بدەم: یەکەمیان ئەوەیە کە باشترە ئەگەر خوێنەر ئاشنایەتی لەگەڵ دنیای پێسەوا و تابوکیدا نییە، ئەوا بچێت دوایین

بەش بخوێنێتەوە، کە پەیوەندی بە ژیاننامەی ئەو کەسانەوە هەیە، کە لە کتێبەکەدا ناویان هاتووە، دوای ئەوە بگەڕێتەوە سەر خوێندنەوەی ڕۆمانەکە.

دووەم تێبینی پەیوەندی بەوەوە نییە، کە ڕستەکان بۆچی ئەوەندە فاریزەی تیادا بەکارهێنراوە، چونکە لە وەرگێڕانەکەی حەبەش و ئیسپانییەکەشدا وایە و منیش تا بۆم کراوە پەیوەست بووم پێیەوە، بەڵکو دەمویست لەبارەی ئەوەوە تێبینی بدەم، کە زۆربەی ڕستەی ناو ڕۆمانەکە پەیوەندییان بە ژیانی پێسەوا و کەسایەتییەکانی و دنیای نووسین و بیرکردنەوەیانەوە هەیە و خوێنەر دەبێت لە پاشخانی ئەو ڕستە و زاراوە و ناوانە لە دنیای پێسەوادا ئاگادار بێت. چونکە تێنەگەشتن لەوانە، وا دەکات خوێنەر تەواو لەدەقەکە تێنەگات. ئەگەرچی من هەوڵمداوە هەندێکیان لە پەراوێزدا ڕوون بکەمەوە، بەڵام هێشتا هەندێک ناو ماون، کە خوێنەر دەبێت بۆخۆی بەدوایاندا بگەڕێت، تا بتوانێت لە ڕۆمانەکە باشتر تێبگات.

***



٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٣٥

# ژیانم لە خۆم بەهێزتر بوو

وتی: یەکەمجار دەبێت ڕیشم بتاشم، حەزناکەم بە ڕیشێکی سێ ڕۆژ هاتووەوە بچم بۆ نەخۆشخانە، تکاتان لێ دەکەم ماناسیسی سەرتاشم بۆ بانگ بکەن، ئەو لە سەرەتای شەقامەکە دەژی.

دەرگاوانەکە وتی: بەڵام بەڕێز پێسەوا کاتمان نییە، تەکسییەکە گەشتووە، هەروەها هاوڕێکانیشت ئەوەندە نابێت گەشتوون و لە بەردەرگای باڵەخانەکە چاوەڕوانتن.

ئەوە گرنگ نییە، ئێمە هەمیشە کاتمان هەیە. وەڵامی دایەوە.

لەسەر ئەو کورسییە بچوکە دانیشت، کە هەمیشە ماناسیس لەسەری ڕیشی بۆ دەتاشی، دەستی بەخوێندنەوەی شیعرەکانی سان کارنییرۆ[1] کرد.

***

ئاغای ماناسیس خۆی کرد بە ژووردا و سڵاوی لێ کرد: ئێوارەت باش ئاغای پێسەوا، پێیان وتم تۆ باش نیت، ئاواتەخوازم شتێکی مەترسیدار نەبێت.

خاولییەکی لە ملی ئاڵاند و دەستی بە سابون لێدانی ڕیشی کرد.

---

١ لە پاریس دەژیا و پێسەوا لەوێ دەیناسێت و سەرسام دەبێت پێی و لە ڕێگای ئەویشەوە ڕێبازی شیعری پێشڕەو دەناسێت. خۆی دەکوژێت و ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر پێسەوا و گۆشەگیربوونی بۆ ماوەی بیست ساڵ تا مردنی. (و.ک)

پێسەوا وتی ئاغای ماناسیس شتێکم بۆ باس بکە، تۆ زۆر وردە چیرۆکی گرنگ دەزانیت، چونکە لە سەرتاشخانەکەت چاوت بە زۆر کەس دەکەوێت، شتێکم بۆ باس بکە.

***

پێسەوا قاتێکی تۆخی لەبەرکرد، کە بەو دواییانە بە دوورینی دابوو، بۆینباخێکی (پاپیۆن)[2]ی بەست و چاویلکەکەی لە چاو کرد. کەش و هەوا سارد نەبوو، بەڵام لە دەرەوە باران دەباری، لەبەرئەوە بارانپۆشە زەردەکەی لەبەرکرد، پاندان و دەفتەری تێبینییەکانی هەڵگرت و لە قادرمەکان چووە خوارەوە.

لە ناوەڕاستی قادرمەکاندا، فرانشیسکۆ گۆفییا و ئەرماندۆ تێکسیرای هاوڕێی بینی. ئەوان نیگەران دیاربوون و هەریەکەشییان، چەترەکەی خۆی بە دەستەوە بوو، کە ئاویان لێ دەچۆڕا.

لەگەڵت دێین. هەردووکیان پێکەوە وایان وت.

پێسەوا زەردەخەنەیەکی کرد، زەردەخەنەیەکی بێ ئاگایانەی کرد. سەرلەنوێ لەلای ڕاستیدا هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد. ئەمەش ڕێی لێدەگرت خۆش ڕەفتاربێت. هەردوو هاوڕێکەی دەستییان دایە تا لە دابەزیندا یارمەتی بدەن. بەڵام ئەو ڕەتی کردنەوە و دەستی بە محاجەرەکەوە گرت. لە بەردەرگای باڵەخانەکە، ئاغای مواتینهۆ دو ئەلمییدای خاوەنکارەکەی بینی، کە لەگەڵ شۆفێرەکە قسەی دەکرد.

ئاغای پێسەوا منیش دێم. ئاغای مواتینهۆ دو ئەلمییدا بە پەرۆشییەوە وای وت. واچاکە منیش بێم، ناتوانم لێگەڕێم ئاوا بڕۆیت.

ئاغای مواتینهۆ دو ئەلمییدا خۆت نارەحەت مەکە، پێسەوا بە

---

٢ پاپیۆن: ئەو بۆینباخەیە، کە لەشێوەی پەپوولەدایە. (و.ک)

هێواشی وای وت، دوو هاوڕێکەم لەگەڵم دێن، خۆت زەحمەت مەدە.

بەڵام بە ئاغای مواتینهۆ دو ئەلمیداوە وا دیار بوو بڕیاری خۆی دابێت، هەربۆیە دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی بۆ کردەوە، پێسەوا لە پێشەوە بە تەنیشت شۆفێرەکەوە دانیشت، لەکاتێکدا سێ هاوڕێکە چوونە دواوە.

❊❊❊

ئۆتۆمبیلەکە بە بەردەم کڵێسای (ئیسترێلا)دا ڕۆیشت، پێسەواش لە جامەکەوە ماوەیەکی زۆر سەیری گومەزەکەی کرد. کڵێساکە، بە گومەزە مەزنە بارۆکی[٣] و دەروازە ڕازاوەکەیەوە، کڵێسایەکی جوان بوو. لەو باخەدا -کە لەبەردەم کڵێساکەدایە- پێش چەند ساڵێک لەمەوبەر، ئا لێرەدا ژوانی لەگەڵ ئۆفیلیا کویرۆزی تاقە خۆشەویستییە گەورەکەی دەبەست و لەسەر کورسیی باخی (ئێسترێلا) ماچی شەرمنانە و بەڵێنی فەرمیان دەگۆڕییەوە، کە تا ئەبەد یەکترییان خۆشبووێت.

بەڵام ژیانم لە خۆم و خۆشەویستییەکەشم بەهێزتر بوو، پێسەوا لەژێر لێوەوە وای وت. بمبەخشە ئۆفیلیا، دەبوو بنووسم، هیچی ترم لەسەر نەبوو جگە لەوەی بنووسم، نەمدەتوانی هیچیتر بکەم. ئێستاش هەموو شتێک تەواو بووە.

تەکسییەکە بە بەردەم پەرلەماندا تێپەڕی، پاشان هێواش خۆی کرد بە (ئەلکالسداد دو کۆمبرۆ)دا. ساڵانێکی زۆر بەر لە ئێستا لەم ناوچەیە ژیابوو، ژوورێکی بەکرێ گرتبوو. خاوەنەکەی ژنێک بوو بەناوی دۆنا ماریا داس فیرتودیس. باش لە بیریەتی،

---

٣ بارۆک: بۆ یەکەمجار ئەم زاراوەیە لە سەدەی ١٧دا بەدەرکەوت، ئەویش لە پیشەی زەڕنگەریدا. دوای ئەوە بە هەموو کارێکی هونەری دەوترا کە نامۆ و پڕ لە زەخرەفە بێت. ئەم شێوازە بە مەزنیو وردەکاری دەناسرێتەوە، وەک کۆشکی ڤێرسای لە فەرەنسا. (و.ک)

خانمێک بوو لە تەمەنی شەست ساڵیدا، سنگێکی شۆڕەوەبووی هەبوو، قژێکی بە ڕەنگی زەرد بۆیە کراویش، هەموو ئێوارەیەک ئەمی بانگ دەکرد تا بچێت و لیکۆری گێلاسی لەلا بخواتەوە و لە دانیشتنە ڕۆحانییەکانیدا بەشدار بێت، کە پەیوەندی بە مێردە مردووەکەیەوە، مارشال بێرییرا، دەکرد و لەگەڵیدا دەکەوتە گفتوگۆی درێژ لەبارەی جەنگەکانی ئەفریقا و تەنانەت نرخی بیبەریشەوە. پاشان لەگەڵ پێسەوادا، یەکی پێکێکی بچوکیان لە جینجیهاها[٤] دەخواردەوە و خۆشاوی گێلاسیان دەخواردو پێسەوا بە وتنی شەوت شاد دۆنا ماریا داس فیرتودیس، خەوێکی خۆش بۆتان، ڕوخسەتی لێ دەخواست و دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. لەو ئێوارانەدا پەیوەندی بە (بێرناندۆ سواریس)ەوە دەکرد. (کتێبی نائارامی) بۆ دەنووسی. دەمەو بەیانییان هەڵدەستا تا ڕووناکییە گۆڕاوەکانی سەر لیشبۆنە و تۆنەکانی ببینێت، ئەوەشی لە یاداشتە دەفتەرێکدا تۆمار دەکرد، کە بەرگێکی چەرمی هەبوو، دایکی لە ئەفریقای باشوورەوە بۆی ناردبوو.

***

کاتێک گەشتنە شەقامی (لوز سوریانۆ)، پۆلیسێک ڕایگرتن.

پۆلیسەکە وتی مەحاڵە تێپەڕن، شەقامەکە بە خۆپیشاندانێکی نیشتمانیی گیراوە، لەوێ هەرا و زەنایە، ئەمڕۆ، لە شارەکەدا جەژنە.

ئاغای مواتینهۆ خۆی بەسەر دەرگاکەدا چەماندەوە. بە متمانە و جدییەتەوە وتی: من دکتۆر مواتینهۆ دو ئەلمییدام، دەبێ بچین بۆ نەخۆشخانەی قەشە لویسی فەرەنسی، نەخۆشێکمان پێیە.

پۆلیسەکە کڵاوەکەی بەرزکردەوە و سەری خوراند. وتی:

---

٤ لیکۆر و جینجیهاها دوو شەرابی پورتوگالین.

گـوێ بگـرن بەڕێزینـە، ڕێگـە دەدەم ڕێڕەوتـان کەمێـک بگـۆڕن، ڕێگاکـەش ئاڕاسـتەکەی پێچەوانەیـە، بـەڵام لـەم حاڵەتـەدا، دەتوانـن بـڕۆن، پێـچ بکەنـەوە بـە لای ڕاسـتدا، پاشـان یەکەوڕاسـت ڕووبکەنـە لای چـەپ، ئیـدی خۆتـان لـە شـەقامی (بایـرۆ ئەلتـۆ) دەبیننـەوە.

پێسـەوا پێکەنـی، چونکـە پۆلیسـەکەی ناسـییەوە. نـاوی کۆیلهـۆ باشـیکۆ بـوو، یەکێـک لـە هاوشـێوە دەگمەنەکانـی خـۆی بـوو، ئـەو کەسـێک بـوو تەنهـا جارێـک نەبێـت، ئیـدی شـیعری نەنووسـیوە، ئـەوەی نووسیشـی تەمومـژاوی و ڕوانینـاوی[5] و خـاوەن شـێوازێکی گوتیـی[6] نـوێ بـوو. کۆیلهـۆ باشـیکۆ لێـرە چـی دەکات، کـە خـۆی لـە بەرگـی پۆلیسـدا گـۆڕیـوە؟

لەوانەیـە مامۆسـتا[7] بـۆ ئەمـی ناردبێـت تـا ئـەو ڕێگایـەی بـۆ بکاتـەوە، کـە دەبێـت بیگرێتـە بـەر. پێسـەوا دەسـتی بـەرز کـردەوە و بـە هێمایەکـی نهێنـی، ئاماژەیەکـی بـۆ کـرد. کۆیلهـۆ باشـیکۆش لـەلای خۆیـەوە بـە هێمایەکـی نهێنـی، ئامـاژەی بـۆ کـردەوە، ئۆتۆمبیلەکـە لـە یەکـەم شـەقام بـەلای ڕاسـتدا ڕۆیشـت.

***

لـە پرسـگەی نەخۆشـخانەکە، سسـتەرێکی لـێ بـوو باوێشـکی دەدا، ئاغـای مواتینهـۆ دو ئەلمییـدا قسـەی لەگـەڵ کـرد، داوای پزیشـکی

---

٥ ڕوانینـاوی- ڕوئییـەوی: ئـەو ڕێبـازە شـیعرییەیە کـە شـاعیرەکانی توانـای ڕۆچـوون بـە نادیـار و پەنهانەکانیانـدا هەیـەو ڕامبـۆ یەکێکـە لـە شـاعیرە دیارەکانـی ئـەم ڕێبـازە. (و.ک)

٦ ئـەو جـۆرە هونەرەیـە لـە سـەدەی دوانـزەوە سـەریهەڵداو دەگەڕێتـەوە بـۆ خێڵـە گوتییـە ئەڵمانییـەکان، کـە لـە سـەدەی پێنجـدا ئیتالیایـان داگیرکـرد، وەک هونەرێکـی بەربـەری سـەیر دەکـرێ، چونکـە دەگەڕایـەوە بـۆ ئـەو نەتەوانـەی بەهـا ڕۆمانییەکانیـان تێکشـکاندو ئـەم هونـەرەش پەیوەسـتییەکی زۆری بـە چیرۆکـە ترسـناکەکانەوە هەیـە. (و.ک)

٧ پێدەچێت مەبەستی ئەلبەرتۆ کایرۆ بێت، وەک دواتر دەبینین.(و.ک)

ئێشک گری کردو وتی حاڵەتەکە پەلەیە.

پێسەوا لەسەر قەنەفە یەک تاکییەکە دانیشت و دەستی بە خەون بینین کرد. بەشێک لە منداڵیی خۆی دەبینی، دەنگی دیۆنیزیای داپیرەی دەبیست، کە لە پەناگایەک مرد. نەنکی پێیدەوت فێرناندۆ تۆ وەک من دەبیت، چونکە خوێن نابێت بە ئاو، بە درێژایی ژیانت هاوەڵیت دەکەم، چونکە ژیان شێتێتییە و تۆش دەزانیت چۆن بەشێتێتی بژیت.

وەرە لەگەڵم، پزیشکەکە وای وت و قۆڵی گرت تا هەڵی بستێنێت.

هاوەڵیی کرد بۆ ژوورێک، چەرپایەکی بچوکی تیابوو، بۆنی دیتۆڵی لێدەهات.

پزیشکەکە فەرمانی پێ کرد: جلەکانت دابکەنە.

پێسەوا جلەکانی داکەند.

پزیشکەکە فەرمانی پێ کرد: ڕاکشێ.

پێسەوا ڕاکشا.

پزیشکەکە دەستی بە پشکنینی کرد، دەستی لە لەشی دەدا، گەشتە شوێنی جگەری، پێسەوا ناڵاندی.

پزیشکەکە لێی پرسی: لە کەیەوە هەست بە ئازار دەکەیت؟

پێسەوا وەڵامی دایەوە: لە پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆوە.

پزیشکەکە لێی پرسی: هەستت بە چی دەکرد؟

پێسەوا وەڵامی دایەوە: ئازاری زۆر، سەوزاوێکیشم هەڵهێنایەوە.

پزیشکەکە سستەرەکەی بانگ کردو پێیوت نەخۆشەکە لە ژووری ژمارە ٤ دابنێت. دوای ئەوە فایلەکەی هەڵگرت و لە کارتی نەخۆشییەکەی نووسی: نەخۆشیی جگەر.

پێسەوا خواحافیزی لە هاوڕێکانی کرد، ئاغای مواتینهۆ دو

ئەلمییدا ئارەزوی دەکرد بمێنێتەوە، بەڵام پێسەوا بە میهرەوە بەڕێی کرد و بەپەلە دوو هاوڕێکەی تریشی لە ئامێزگرت.

وتی: هاوڕێ ئازیزەکانم ئەمشەو لێم گەڕێن، لەوانەیە سبەینێ، کەسێک بێت سەردانیم بکات، دوو سبەی یەکتر دەبینینەوە.

❊❊❊

ژوورەکە، کونجێکی سادە بوو، چەرپایەکی ئاسن و دۆڵابێکی سپی و مێزێکی بچوکی تیابوو.

پێسەوا لەسەر چەرپاکە دانیشت، گلۆپی سەر کۆمەدییەکەی داگیرساند، سەری خستە سەر سەرینەکە و دەستی بەلای ڕاستیدا هێنا. خۆشبەختانە، ئازارەکە کەمتر ببوو. سستەرەکە پەرداخێک ئاو و دەنکە حەبێکی بۆ هێنا، پاشان وتی: بمبوورە، دەبێت دەرزییەکت لێ بدەم، پزیشکەکە فەرمانی ئەوەی داوە.

پێسەوا داوای قومێک (لۆدانۆم)ی کرد، ئەوەش خەولێخەرێک بوو، لەسەر بەکارهێنانی ڕاهاتبوو، کاتێک-بەو سیفەتەی بێرنادرۆ سواریس بوو- و نەیدەتوانی بخەوێت. سستەرەکە بۆی هێنا و پێسەواش خواردییەوە.

ناوم کاتارینایە، سستەرەکە وای وت، ئەگەر پێویستت پێم بوو زەنگم بۆ لێبدە، دەستبەجێ دێم.

❊❊❊

# کاتی تارماییەکان

پێسەوا پرسی: سەعات چەندە؟

نزیکەی نیوە شەوە، ئەلفارۆ دو کامپۆس وەڵامی دایەوە، ئەمە باشترین کاتە بۆ بینینت، ئەمە کاتی تارماییەکانە.

پێسەوا پرسی: بۆچی هاتوویت؟

ئەلفارۆ دو کامپۆس وەڵامی دایەوە: هەندێک شت هەیە لەبارەیەوە بدوێین، چونکە ئەگەر تۆ کۆچی دواییت کرد، ئەوا من دوای تۆ ناژیم، منیش لەگەڵتدا کۆچی دوایی دەکەم، ئیدی پێش ئەوەی ڕۆچینە ناو تاریکییەوە، هەندێک شتمان هەیە لەبارەیەوە بدوێین.

پێسەوا پشتی بە سەرینەکەیەوەدا، قومێک ئاوی خواردەوە و پرسی: ئەی تۆ چیت کردووە؟

ئازیزم، ئەلفارۆ دو کامپۆس وەڵامی دایەوە،-بە خۆشحاڵییەوە دەبینم بە ئەندازیار بانگم ناکەیت و بەڕێزیشەوە قسەم لەگەڵ ناکەیت و بێ هیچ زۆر لە خۆکردنێک هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکەیت.

ئەی چۆن، پێسەوا وەڵامی دایەوە، تۆ هاتیتە ژیانمەوە، بوویتە ئەلتەرناتیڤی من، هۆکاریش بوویت بۆ کۆتایی هێنانی پەیوەندییەکەم لەگەڵ ئۆفیلیا.

ئەوەم لەبەر خاتری تۆ کرد، ئەلفارۆ دو کامپۆس درێژەی پێدا،

چونکە ئەو کچە گەنجە سەربەدەرە، بۆ پیاوێک نە دەگونجا لە تەمەنی تۆدا. هاوسەرگیرییەکەتان سەرکەوتوو نەدەبوو. پاشان، تۆ دەزانیت هەموو ئەو نامەی خۆشەویستییانەی بۆت نووسی، قسەی قۆڕ بوون. لەو باوەڕەدام هەموو نامە دڵدارییەکان بێ مانان، لە کۆتاییدا، لە سەخافەت ڕزگارم کردیت. هیوادارم لەپای ئەوە سوپاسم بکەیت.

پیسەوا بە پرتەوبۆڵەیەکەوە وتی: خۆشمدەویست.

ئەوە خۆشەویستییەکی بێ مانایە، ئەلفارۆ دو کامپۆس وەڵامی دایەوە.

بەڵێ، لەوانەیە وا بێت، بە دڵنیاییەوە، پێسەوا وەڵامی دایەوە، ئەی تۆ؟

کامپۆس وتی: من؟ من، باشە، من ڕۆحی گاڵتەم هەیە، سۆناتایەکم نووسی، هەرگیز پێم نەوتوویت، چونکە باسی خۆشەویستییەک دەکات، کە بێزارت دەکات، لەبەرئەوەی بە کوڕە لاوێکم پێشکەش کردووە، لاوێک لە ئینگلتەرا خۆشمویست و خۆشیویستم. سەرئەنجام، لەدوای ئەم سۆناتایەوە، ئەفسانەی خۆشەویستییە چەپێنراوەکەت لەدایک دەبێت، ئەوەش هەندێک ڕەخنەگر دڵخۆش دەکات.

پێسەوا لەژێر لێوەوە وتی بە ڕاست کەسێکت خۆشویستووە.

بەڕاستی کەسێکم خۆشویست، کامپۆس بە هێواشی وەڵامی دایەوە.

کەواتە، من دەتبەخشم، پێسەوا وای وت، من گەردنت ئازاد دەکەم. لەو باوەڕەدا بووم لە ژیانتدا جگە لە تیۆرییەکان، هیچت خۆش نەویستووە.

نەخێر، کامپۆس وای وت و لە چەرپاکە نزیک بوەوە، هەروەها

ژیانیشم خۆشویستووە، ئەگەر لە سرودە ئایندەخوازیی[8] و تەمومژاوییەکانمدا بە گاڵتەجاڕییەوە نووسیبێتم، ئەگەر لە شیعرە نهیلیستییەکانمدا هەموو شتێکم بە خۆشمەوە وێران کردبێت، ئەوە بزانە لە میانەی ژیانمدا، منیش خۆشەویستیم کردووە، بە ئازارێکی هۆشمەندانەوە خۆشەویستیم کردووە.

پێسەوا دەستی بەرزکردەوە و بە جوڵەیەکی تەمومژاوی ئاماژەیەکی کرد. وتی: ئەلفارۆ لێت دەبوورم. لەگەڵ خوداوەندە نەمرەکاندا برۆ، ئەگەر خۆشەویستیت کردووە، ئەگەر تەنها جارێک خۆشەویستیت کردووە، ئەوا بەخشراویت، چونکە تۆش مرۆڤیت، مرۆڤایەتییەکەت بەخشیتی.

کامپۆس پرسی: دەتوانم جگەرە بکێشم.

پێسەوا بە ئەرێیی سەری ڕاوەشاند. کامپۆس قوتوویەکی زیوی لە گیرفانی دەرهێنا و جگەرەیەکی دەرکرد، کردییە سەبیلێکی عاجەوە و دایگیرساند. وتی:

فێرناندۆ دەزانی من تاسەی ئەو ماوەیە دەکەم تیایدا شاعیرێکی سوک و ڕسوا بووم. کاتێک ئەو سەفەرەم کرد لەسەر پشتی کەشتییەک لە دەریاکانی ڕۆژهەڵاتدا، بەڵێ، ئەوکاتە، شایەنی شیعرنووسین بووم لەژێر تریفەی مانگدا، دڵنیات دەکەمەوە، لە ئێوارەدا، لەسەر پردەکە، کاتێک ئاهەنگێک لەسەر پشتی کەشتییەکە هەبوو، ئەوکاتە مانگ زۆر کەرنەڤاڵئامێزانە و تەنها هی منیش بوو. بەڵام لەو سەردەمەدا، گەمژە بووم، گاڵتەم

---

٨ ئەو بزوتنەوەیەیە لە سەرەتای سەدەی بیستدا لە ئیتالیا و ڕوسیا و ئینگلتەرەدا دروست بوو، فیلیپۆ مارینیتی بە دامەزرێنەری دادەنرێت. بەواتای ڕووکردنە ئایندە، جیابوونەوە لە ڕابردوو و ڕۆشنبیرییەکی نوێ دێت و لە هەموو بوارە هونەری و ئەدەبییەکاندا چالاک بووە. (و.ک)

بە ژیان دەهات، نەمدەزانی چۆن چێژ لەو ژیانە وەربگرم کە پێمدرابوو، ئیدی ئاوا ئەو هەلەم لەدەستدا و ژیانیشم بە با چوو.

دوای ئەوە؟ پێسەوا پرسی.

دوای ئەوە، ئارەزووم لەوە بوو سیمبولەکانی واقیع بکەمەوە، وەک ئەوەی بتوانرێت سیمبولەکانی بکرێتەوە، دوای ئەوە تووشی نائومێدی بووم. لەگەڵ نائومێدیدا، نهیلیستییەت. دوای ئەوە، ئیدی باوەڕم بە هیچ شتێک نەدەکرد، تەنانەت بە خۆشم.

ئەمڕۆ من لێرەم، نزیک چەرپاکەت، وەک پارچە پەڕۆیەکی بێ کەڵک. جانتاکانم ئامادەکردو نەڕۆیشتم بۆ هیچ شوێنێک. دڵم هیچ نییە جگە لە دەفرێکی بەتاڵ.

کامپۆس بەرەو کۆمەدییەکە ڕۆشت و جگەرەکەی لە قاپێکی بچوکی فەخفوریدا پلیشاندەوە.

درێژەی پێدا: باشە، ئازیزم پێسەوا، من پێویستم بەوە بوو، ئێستا، هەموو ئەمانەت پێ بڵێم. لەوانەیە جیاببینەوە، دەبێت بڕۆم، هەروەها، کەسانی تر دێن بۆ دیدەنیت، ئەوە دەزانم، وەختێکی زۆر نەماوە، ماڵئاوا.

کامپۆس پاڵتۆکەی دا بەشانیدا، مۆنۆکلەکەی[9] خستە بەر چاوی ڕاستی، بە ئاماژەیەکی خێرای دەست، سڵاوی لێکرد، دەرگاکەی کردەوە، کەمێک وەستا و گەڕایەوە: ماڵئاوا فێرناندۆ، پاشان چپاندی: لەوانەیە، نامەکانی خۆشەویستی هەموویان سەخیف نەبن. دوای ئەوە دەرگاکەی پێوەدا.

***

---

۹ مۆنۆکل: چاویلکەی یەک چاو.

## تەنها باسم لەو زەمەنە کردووە کە بەسەردەچێت

سەعات چەند بوو؟ پێسەوا هیچی نەدەزانی. ئایا شەو بوو؟ ئایا ڕۆژ ببووەوە؟ سستەرەکە هات و دەرزییەکی تری لێدا. ئیدی پێسەوا لەلای ڕاستیدا هەستی بە ئازار نەدەکرد. ئەو، ئا ئێستا، خۆی لە ئارامییەکی سەیردا دەبینییەوە، وەک ئەوەی تەم لەسەری نیشتبێت.

ئەوانی دیکە، بیری کردەوە، ئێستا ئەوانی دیکەش دێن. بە دڵنیاییەوە، حەزی دەکرد پێش ئەوەی بڕوات، سڵاویان لێ بکات. بەڵام دیدەنییەک هەیە غەمگینی دەکات، ئەویش بینینی کایرۆی مامۆستایەتی. چونکە کایرۆ لە (ڕیباتیخۆ)وە دێت و تەندروستیشی لاوازە. چۆن دێت بۆ لیشبۆنە، بڵێی بە ئەسپ و عەرەبانە بێت؟ ڕاستە کایرۆ مردووە، بەڵام هێشتا هەر زیندووە، ئەو بۆ ئەبەد لەو خانووە بچوکە سپیکاری کراوە بە گەچی (ڕیباتیخۆ) زیندوو دەمێنێتەوە، کە بە دوو چاوی بزەوە سەیری تێپەڕینی وەرزەکان و بارانی زستان و چلەی هاوینی دەکرد.

گوێی لە دەنگی دەرگا بوو، وتی: وەرە ژوورەوە.

ئەلبەرتۆ کایرۆ چاکەتێکی قەیفەی ملیوان فەرووی لەبەردا بوو. ئەو پیاوێکی لادێیی بوو، ئەوەش بە جلوبەرگەکەیدا دیاربوو. سڵاو، ئەی مامۆستام، پێسەوا وای وت. سڵاوتان لێ بێت.

کایرۆ لە پێچکەی چەرپاکە نزیک بوەوە و قۆڵی گرت و وتی:

ئازیزم پێسەوا، هاتووم تا شتێکت پێ بڵێم، ڕێگەم پێدەدەیت دانپێدانانێکت بۆ بکەم؟

تکایە، پێسەوا وەڵامی دایەوە.

کایرۆ وتی: زۆر چاکە، کاتێک شەوان، مامۆستایەکی ون و نادیار، خەبەری دەکردیتەوە و شیعرەکانتی بۆ دەخوێندیتەوە تا بیاننووسیتەوە، کاتێک ئەو لە تۆدا و لە ڕۆحتدا دەدوا، بابزانیت، ئەو مامۆستایە من بووم، ئەوە من بووم، لە ئاسمانەوە، پەیوەندیم پێوە دەکردیت.

پێسەوا وتی: منیش هەر وام مەزەندە دەکرد، مامۆستای ئازیزم، وام گریمانە کردبوو ئەوە تۆ بیت.

کایرۆ وتی: لەبەرئەوە دەبێت ئێستا داوای لێ بووردنت لێ بکەم، چونکە من تووشی خەوزڕاندنێکی زۆرم کردیت، شەو لە دوای شەو خەوزڕاندن، کە نەخەوتیت تیایاندا، بەردەوام هەر دەتنووسی وەک ئەوەی مێشکت خرۆشابێت، هەست بە پەشیمانی دەکەم، چونکە من تووشی مەشەقەتی زۆرم کردیت، چونکە من ڕۆحتم سەرقاڵ کرد.

پێسەوا وەڵامی دایەوە: تۆ لە بەرهەمەکانمدا بەشدار بوویت، تۆ دەستمت دەجوڵاند و ئاڕاستەت دەکرد، ڕاستە تۆ بوویتە هۆی خەوزڕاندنم، بەڵام بۆ من شەوانێکی بە پیت بوون، چونکە بەرهەمی ئەدەبیم لە شەودا لەدایک بوو، بەرهەمی من بەرهەمێکی شەوانەیە.

کایرۆ چاکەتەکەی داکەند و لەسەر دەسکی چەرپاکە داینا.

ئەمە تاکە شتێک نییە حەزدەکەم پێتی بڵێم، لەژێر لێوەوە وای وت، نهێنییەک هەیە حەزدەکەم بۆتی ئاشکرا بکەم، پێش

ئەوەی ماوەکان بەنێوان ئەستێرەکاندا لێکمان جیابکەنەوە، بەڵام نازانم چۆن ئەوەت پێ بڵێم.

پێسەوا وتی: سادە و ساکار پێم بڵێ، هەروەک چۆن شتێکی تر دەڵێیت.

کایرۆ وتی: زۆر باشە، من باوکتم.

بۆ ساتێک وەستا، بەدەست مووە کەمە ڕەشەکانی تەخت کرد، پاشان بەردەوام بوو:

ڕۆڵی باوکتم گێڕا، باوکی ڕاستەقینەت، جواکیم دو سیابرا پێسەوا، کاتێک هێشتا تۆ منداڵ بوویت، بە نەخۆشی سیل مرد. باشە، ئیدی من ڕۆڵی ئەوم بینی.

پێسەوا پێکەنی. وتی: ئەوەم دەزانی، هەمیشە وەک باوکم حسابم بۆ کردبوویت، تەنانەت لە خەونەکانیشمدا، تۆ هەمیشە باوکم بوویت، ئەی مامۆستام شتێک لەمەدا نییە تا سەرزەنشتی خۆتی لەسەر بکەیت، بەلای منەوە باوک بوویت، ئەو باوکەی ژیانی ڕۆحیی پێ بەخشیم.

کایرۆ وەڵامی دایەوە: لەگەڵ ئەوەشدا ژیانێکی سادە ژیام، ژیانم کورت بوو، کە بە هاوەڵێی پورێک لە خانوویەکی گوند بەڕێم کرد، تەنها باسم لەو زەمەنە کردووە بەسەردەچێت، لەبارەی وەرزەکان، لەبارەی مێگەلەوە.

بەڵێ، پێسەوا جەختی کرد، بەڵام تۆ بۆ من چاو و دەنگ بوویت، چاو بوویت وەسفت دەکرد و دەنگێکیش، هەر وەک میلاریبا یاخود سوکرات، کە موریدەکانی فێر دەکرد.

کایرۆ وتی: کەم تا زۆر من کەسێکم بێ ڕۆشنبیری، ژیانم زۆر ساکار بوو، جارێکی تر پێت دەڵێمەوە، تۆ، تۆ ژیانێکی چڕو پڕ

ژیایت، بە پێچەوانەی منەوە، تۆ ڕاڤەی پێشڕەوی ئەورووپیت[10] کرد، هەردوو ڕێبازی هەستەکی و یەکتربڕت[11] داهێنا، هاتوچۆی چاپخانە ئەدەبییەکانی پایتەختت کرد، لەکاتێکدا من شەوەکانم، دوای نانی شێو، بەیاری کاغەز لەبەردەم چرایەکی نەوتدا بەسەر دەبرد، ئیتر چۆن ڕێی تێدەچێت من بووبمە باوک و مامۆستات؟

پێسەوا وەڵامی دایەوە: ژیان زۆر سەختە، پێویستە هەرگیز پرسیار نەکەیت، هەرگیز باوەڕت نەبێت، هەموو شتێک شاراوەیە.

بەڵێ، کایرۆ دووبارەی کردەوە، بەڵام هەر سوورم، چۆن ڕێی تێدەچێت من بووبمە باوک و مامۆستات.

پێسەوا پاڵیدا بە سەرینەکەیەوە. بە زەحمەت هەناسەی دەدا، ژوورەکەش لەبەرچاوی دەسوڕایەوە. وەڵامی دایەوە:

ئازیزم کایرۆ، ئەوەت پێدەڵێم، لە ڕاستیدا، من پێویستم بە چاوساغێک و بە هەوێنێک هەبوو، نازانم ئەگەر باش گوزارشت دەکەم یا نا، بێ تۆ ژیانم وەک پارچەی ورد، پەرش و بڵاو دەبووەوە. بەهۆی تۆوە خۆم ڕاگرت، لە ڕاستیدا ئەوە من بووم، کە وەک باوک و مامۆستا هەڵی بژاردیت.

دەی، دیارییەکم بۆ هێناویت، کایرۆ وای وت، ئەویش چەند دێڕە پەخشانێکە، کە هەرگیز بڵاویان ناکەمەوە، ئێستا، بەوپێیەی بەجێم دەهێڵیت، وا دەکەم بە دەمی پێتی بڵێم، ئەمەش شایەتیی لەسەر هەست و سۆزم لە بەرانبەر تۆدا دەدات.

کایرۆ کاغەزێکی بچوکی لە گیرفانی دەرهێنا، چونکە بینایی کز بوو، نزیکی کردەوە لە چاوی و خوێندییەوە: لە میانەی ئەم ساڵە

---

[10] ڕێبازێکی ئەدەبی و شیعرییە. (و.ک)

[11] دوو قوتابخانەی ئەدەبیین، Sensationnismeو Intersectionnisme کە پێسەوا داهێنەریانە. (و.ک)

درێژانـەدا، هەمیشە سـەیری مانگم کـرد، بـەڵام بـە نیگایەکـی بێ گـەرد، بـە دوای کوڕەکـەم و مورىدەکـەم کەوتـم، تـا نیـگام بتوانێـت نیـگای ئـەو بێـت، تـا ئـەو گـردەی ئاسـۆم لـێ دادەبڕێـت، ببێتـە ئاسـۆیەکی متـەوازع و سەرسـوڕهێنەری ئـەو.

پێسـەوا وتـی: شـیعرێکی زۆر نایابـە، سوپاسـت دەکەم ئەی مامۆسـتا کایرۆ، لەگـەڵ خـۆم هەڵـی دەگـرم بـۆ ئاسـمان.

پێشـتر تـۆش زۆر شـیعرت لەبـری مـن نووسـی، ئەلبەرتـۆ کایـرۆ وای وت و درێـژەی پێـدا، هەروەهـا منیش دەمویسـت لـە ڕێـگای سـڵاوی کەسـێکەوە ستایشـت بکـەم، کـە هەمیشـە پێـت سەرسـام بـووە.

بـۆ سـاتێک پێسـەوا چـاوی نوقانـد، کاتێکیـش کردنییـەوە ژوورەکـە چـۆڵ بـوو. زەنگەکـەی لێـدا تـا سسـتەرەکە بانـگ بـکات.

پرسی: ئێمە لە چ ڕۆژێکداین؟

سسـتەرەکە وەڵامـی دایـەوە: شـەوی ٢٨ی تشـرینی دووەمـی ١٩٣٥ه، هیچـت دەوێت.

پیسەوا وەڵامی دایەوە: نا، سوپاس، تەنها حەزدەکەم پشوو بدەم.

***



٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٣٥

# لە دووری چەند کیلۆمەترێك لە لیشبۆنە

پێسەوا گوێی لە دەنگی دەرگاکە بوو، وتی: وەرە ژورەوە.

دەرگاکە کرایەوە، بەڵام هیچ کەسێک نەهاتە ژوورەوە.

دەنگێکی لەرزۆک پرسی: دەتوانم بێمە ژوورەوە؟

پێسەوا وتی: تکایە، وەرە ژووری.

پیاوێـک لەنـاو دەرگاکـە دەرکـەوت و لـە دوای خۆیـەوە دەرگاکـەی بەهێواشـی پێـوەدا، پێسـەوا نەیناسـییەوە، پرسـی: بێ زەحمـەت، تـۆ کێیـت؟

پیاوەکـە بـەدەم هاتنـە ژوورەوەوە وەڵامـی دایـەوە: مـن ڕێـکاردۆ ڕەییسـم، لـە بەرازیلـە ئەندێشـە کراوەکەمـەوە گەڕاومەتـەوە.

پێسـەوا وتـی: سـاڵانێکی زۆر تێپەڕیـوە و یەکمـان نەبینیـوە، سـاڵانێکی زۆر، بمبـوورە، بـەڵام تـۆ زۆر گۆڕاویـت و نەمناسـیتەوە.

ڕیـکاردۆ ڕەییـس کورسـییەکی هەڵگـرت و لـە چەرپاکـەی نزیـک کـردەوە. وتـی: بمبـوورە دادەنیشـم، بـەڵام بـە کەشـتییەکی بارهەڵگـر هاتـم و سـەرەگێژەی دەریـام هەیـە و تووشـی دڵ تێکەڵهاتـن بـووم و هەسـت ناکـەم بـاش بـم.

پێسـەوا لێـی پرسـی: بـەڵام لـە کـوێ خـۆت شـاردبوەوە؟ لـە چ کونجێکـی بەرازیـل، تەنانـەت سـەرکەوتوو نەبـووم لـەوەی پەیوەندیـت پێوەبکـەم؟

ڕیکاردۆ ڕەییس فنی کرد و لوتی پاککردەوە.

ئازیزم پێسەوا، دەبێت ئیعترافێکت بۆ بکەم، چرپاندی، هەرگیز نەچووم بۆ بەرازیل، وام کرد هەمووان لەو باوەڕەدابن کە چووم، تەنانەت تۆش. لە ڕاستیدا، لێرە بووم لە پورتوگال، لە گوندێکی بچوک خۆم شاردبووەوە.

پێسەوا هەوڵیدا خۆی بەسەر پشتییەکاندا بدا و پرسی: ئەی لەکوێ بوویت؟

ڕیکاردۆ ڕەییس دەنگی نزم کردەوە، وەک ئەوەی جگە لە پێسەوا، کەسێکی تر گوێی لێ بێت.

لە ئازیتاو، ڕیکاردۆ چرپاندی، لە ئازیتاو بووم.

پێسەوا وەڵامی دایەوە: ئازیتاو... ئازیتاو... ئەم ناوە لەلام شتێک دەگەیەنێت، ئەم ناوە جۆرە پەنیرێکم بیر دەخاتەوە.

ڕێکاردۆ بە شانازییەوە وتی: تەواو وایە، پەنیری ئازیتاو، (ڤیلا نۆگییرا دو ئازیتاو)، ئەوە گوندێکی بچوکە لە دووریی چەند کیلۆمەترێک لە لیشبۆنە، ڕێک دوای ڕووباری تاج، لەوێدا کە ئەلینتیجۆ دەست پێدەکات.

جارێکی تر ڕیکاردۆ ڕەییس فنی کردو کۆکی.

لەوێ خۆم شاردبووەوە، لە موڵکێکی بچوک لای چەند هاوڕێیەک، هەموو ئەو ساڵانەم لە خانوویەکی گوندیدا بەسەر برد، لەبەردەم خانوەکەشدا دارتوویەکی بە تەمەن هەبوو، لەژێریدا هەموو سروودە مەزنەکان و شیعرەکانم لەسەر شێوازی هۆراس نووسی.

پێسەوا پرسی: ئەی چیت دەکرد تا بژیت، لە کوێ کارت دەکرد؟

ڕیکاردۆ ڕەییس وەڵامی دایەوە:

ئۆهۆو، کارەکە بۆ پزیشکێک ئاسانە تا بژی، ئەوەندەی بەسە

کاری پیشەکەی خۆی بکات، منیش پزیشکی گوندەکە بووم، لە هەموو ناوچەی (لاسبیرادا ئەرابیدا) نەخۆشم هەبوو.

پێسەوا پرسی: ئەی بەناوی ڕاستەقینەی خۆتەوە کارت دەکرد؟

ریکاردۆ جەختی کرد، بە دڵنیاییەوە، ڕەچەتەیەکم هەبوو لێی نووسرابوو (ڕیکاردۆ ڕەییس- پزیشک)، هەرچۆن هەموو گوندەکەش ناویان دەزانیم.

پێسەوا وتی: لەگەڵ ئەوەشدا، لایەنگری پادشایی بوویت، دژی کۆمار بوویت، هەر لەبەرئەوە بوو وتم تۆ بۆ بەرازیل کۆچ دەکەیت.

ڕیکاردۆ ڕەییس پێکەنی، پێکەنینێکی شەرمن و شلەژاوانە. وەڵامی دایەوە: دەزانیت، کارەکە گاڵتەیەک بوو، بەلامەوە گونجاو بوو شاعیرێکی هەستەکی و کلاسیکیی نوێ، هەرگیز کۆماری خۆش نەوێت، هەرچۆن زبریی کۆماریخوازانی خۆش ناوێت. هەمیشە ئاواتەخوازی قەیسەرێک، ئیمپراتۆرێکی مەزنی وەک مارک ئۆریل بووم، شایەنی گەواهیدانی شیعرەکانم بێت. لەناو کۆماریخوازەکاندا کەسێک نەبوو شایەنی بێت، ئەوان خەڵکانێکی قانیع بوون و جگە لە ئۆگست کۆنت، کەسی تریان نەخوێندبوەوە، ئیدی چۆن هۆراس و پیندار[12] دەنرخێنن؟

لێت تێدەگەم، پێسەوا بەدەم ئاخ هەڵکێشانەوە وای وت. بێدەنگییەکی درێژ باڵی کێشا. گوێیان لە دەنگی پێیەک بوو لە ڕاڕەوەکەدا، بەوەی کەسێک بە بەردەم ژوورەکەدا تێپەڕی، بەڵام کەس بێزاری نەکردن. پێسەوا وتی: دوای ئەوە؟

ڕیکاردۆ ڕەییس وەڵامی دایەوە: بەهەرحاڵ، ئیدی، حەزدەکەم

12 لەسەر شێوازی شاعیری یۆنانی پیندارۆس (٥٢٢پ.ز-٤٤٦پ.ز).

ئەوەت پێ بڵێم، من پێم خۆشە نهێنی خۆمت بۆ ئاشکرا بکەم، تۆ دەزانیت، من ژیانێکی ڕەواقیانە[١٣] ژیام، تەنانەت هەرچەندە لە ئازیتاو بووم.

پێسەوا بە ڕەقی وەڵامی دایەوە: ئێمە لە هەر کوێ بین، دەتوانین ژیانێکی ڕەواقیانە بژین.

ڕیکاردۆ ڕەییس وتی: من تاجە گوڵینە دەهۆنمەوە.

پێسەوا پرسی: ئەوە یانی چییە؟

ڕیکاردۆ ڕەییس وەڵامی دایەوە:

واتا، من لە هەموو شیعرەکانمدا، تاجە گوڵینەم بۆ (نایبری)، بۆ (لیدیا) چنیوە، ئێستاش بۆ گەشتەکەی تۆ، تاجە گوڵینە دەچنم، لەپێناو ئەو ساتەدا کە تێیدا دەگەڕێینەوە و بەیەک دەگەینەوە، دوای ئەوەی (ستیکس)ی بەستوو[١٤] دەبڕین.

پێسەوا وتی: ڕیکاردۆی ئازیز من تاجە گوڵینە نموونەییەکەت قبوڵ دەکەم. تکات لێدەکەم، هەر بەردەوام بە لە ژیان لە گوندەکەت و تەنانەت بەبێ منیش هەمیشە سرووده پیندارییەکانت بنووسە، من خۆشحاڵم کە نهێنییەکەی خۆتت بۆ ئاشکرا کردم، بەڵام، باوەڕ بکە، هەمیشە ئەوەم زانی بوو.

بەڕاست؟ ڕیکاردۆ ڕەییس بە سەرسوڕمانەوە پرسی.

پێسەوا وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بەڕاست، هەرگیز نەهاتم بۆ

---

١٣ قوتابخانەیەکی فەلسەفییەو زینونی ڕەواقی (٣٣٣-٢٦٤)پ.ز دامەزرێنەرییەتیو فەزیلەتو لۆژیکو یاسا سروشتییەکان، لە بنەما سەرەکییەکانیەتی. (و.ک)

١٤ لە ئەفسانەی گریکیدا، کاتێک کەسێک دەمرێت، ڕۆحەکەی دەچێت بۆ هادس (جیهانی خوارەوە)، لەم جیهانەشدا دەبێت ڕووباری مەرگ ببڕێت، کە پێی دەوترێت ڕووباری ستیکس هەربۆیە کەسوکاری مردووەکە پارەیەکیان لەگەڵیدا دەناشت، تا بیدات بە چارۆن، کە بە بەلەم مردوو دەگوازێتەوە بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە. (و.ک)

سەردانیت لە ئازیتاو، چونکە بە ڕاستی، هەرگیز لیشبۆنەم جێ نەهێشتووە، چونکە بە ڕاستی هەرگیز حەزم لە سەفەر نەبووە، بەڵام هەمیشە دەمزانی تۆ لێرە دەژیت، لەم نزیکانە، ئەمەش هاوڕێیەک جەختی لێ کردەوە بۆم، کە شتگەلێکی پڕ لە سۆز لەبارەی شیعرەکانمەوە دەنووسێت.

ڕیکاردۆ ڕەییس هەستا، وتی: کەواتە ئیدی دەتوانم مۆڵەت وەربگرم و بۆ خۆم بڕۆم بە لایەکدا.

پێسەوا وەڵامی دایەوە:

هەروەها منیش، بۆ خۆم دەستخۆشیت لێ دەکەم و سەرکەوتوویت، هەربژین و داوات لێدەکەم هەر شیعر بنووسیت، تەنانەت کاتێک کە من لێرەش نابم.

بەڵام ئەوانە شیعرێکی ساختە دەبن. ڕیکاردۆ ڕەییس وەڵامی دایەوە.

پێسەوا وتی: ئەوە گرنگ نییە، هەرگیز شیعرە ساختەکان زیان بە شیعر ناگەیەنن، بەرهەمەکانم زۆر زۆرن، با شیعرە ساختەکانیشی قبوڵ بکرێن، ئازیزم ڕیکاردۆ ڕەییس ماڵئاوا، دەگەڕێینەوە، لەودیو ڕووبارە ڕەشەکەوە بەیەک دەگەینەوە، کە دەوری (ئەڤێرنۆ)[15]ی داوە.

پێسەوا سەری بەسەر سەرینەکەدا شۆڕکردەوە و بۆ ساتێک یاخود بۆ چەند کاتژمێرێک نووست، نەیدەزانی ئەوە دیاری بکات.

***

١٥ ئەڤێرنۆ: چاڵێکە نزیک کیوماس، کامپانیا بەپێی ئەفسانە ڕۆمانییەکان دەروازەی جیهانی خوارەوەیە. لە ئیسپانیو پورتوگالیدا بەمانای دۆزەخ دێت. (و.ک)

# ڕەچەتەی ڕۆبیانی عەرەقکردوو

پێسـەوا لـە خـەو هەسـتا، گڵۆپـی (ئەباجـۆر)[١٦]ە بچوکەکـەی داگیرسـاندو لەسـەر دۆڵابەکـە بـەدوای سـەعاتەکەی دەسـتیدا گـەڕا. کاتژمێرەکـە ئامـاژەی بـۆ سـێ دەکـرد، بـەڵام کاتژمێرەکـە نووسـتبوو. پێسـەوا تێبینـی کـرد هەسـتکردن بـە زەمەنـی ونکـردووە، بیـری کـردەوە زەنـگ لـێ بـدات، بـەڵام لـەوە پەشـیمان بـوەوە، چونکـە هـەر لەوکاتـەدا گوێـی لـە دەنگـی دەرگا بـوو.

دەنگێک پرسی: ئاغای پێسەوا دەتوانم بێمە ژوورەوە؟

پێسـەوا ڕێـگای هاتنـە ژوورەوەی پێـدا، پیاوێـک هاتـە پێشـەوە، کـە سـینییەکی پـێ بـوو، لەنـاو دەرگاکـەدا کەمێـک وەسـتا، بـەڵام پێسـەوا، بەبـێ چاویلکـە و لـە تاریکیـی ژورەکـەدا، نەیناسـییەوە.

پێسەوا پرسی: تۆ کێیت؟

مـن هاوڕێتـم، بێرنـاردۆ سـواریس، وەڵامـی دایـەوە. کـە زانیم لـە نەخۆشـخانەیت، ڕێگـەم بەخۆمـدا بێـم بـۆ سـەردانییت.

بێرنـاردۆ سـواریس لـە چەرپاکـە نزیـک بـوەوە و سـینییەکەی خستە سـەر دۆڵابەکـە. وتی:

---

١٦ وشـەیەکی فەرەنسـییەو بـەو گڵۆپـە بچوکـە دەوترێـت، بـۆ نمونـە لەسـەر کۆمـەدی، لـە تەنیشـت سیسـەمی خـەوەوە یاخـود لەسـەر مێـز دادەنرێـتو بـۆ خوێندنـەوە بەکاردەهێنرێـت، لای خۆمـان (تەیبـڵ لامـپ)ی پـێ دەوترێـت. (و.ک)

نانی ئێوارەم بۆ هێنایت، لەو چێشتخانەیەوە هێناومە، کە هەمیشە تێیدا یەکمان دەبینی. لەو باوەڕەدابووم دەشێ هەر وەک ڕۆژە جوانەکانی ڕابردوو، ئارەزوت لە نانی شێو بێت، ڕێگەشم بەخۆمدا خۆم ژەمی ئێوارەت بۆ هەڵبژێرم.

پێسەوا وەڵامی دایەوە: لە ڕاستیدا، زۆر برسیم نییە، بەڵام تا هەست بە ئاسودەیی بکەیت، شتێک دەخۆم. چیت هێناوە؟

با هەستیت، سینییەکە دەخەمە بەردەمت، بێرناردۆ سوارییس وەڵامی دایەوە، خواردنێکی باوی مەتبەخەکەمانە[١٧]، ژەمی سادەن، بە تامن.

پێسەوا هەستا، ئەو دەسماڵە پاکەی لە ملییەوە ئاڵاند، کە بێرناردۆ سواریس پێیدا، ئەو سەرقاپە کانزاییانەی لادا کە خواردنەکانی داپۆشی بوو.

بێرناردۆ سوارییس وتی: ئەوە قاپێک (کالدۆفێردی)یە، هەریسە دڵپەسەندەکەتە، من دڵنییام حەزت لێی دەبێت، پاشان ئەوە دەورییەک ورگە بە شێوازی خەڵکی پۆرتۆ لێنراوە، ئەمەم بۆ هێناویت، چونکە ڕۆژێکییان بە ساردی دایان پێت، وەک خۆشەویستییەکی ساردو سڕ، ئەوەشت لە یەکێک لە شیعرەکانتدا نووسی، بەڵام من حەزدەکەم بە گەرمی تامی بکەیت، سەیرکە، هێشتا هەڵمی لێ هەڵدەستێت، هەر ئێستا لە فڕن هاتۆتە دەرەوە.

پێسەوا پێکەنی. وتی:

گرفتی جگەرم هەیە، لەوانەیە دەورییە ورگەکە گونجاو نەبێت بۆم، بەڵام، بۆئەوەی دڵخۆشت بکەم، کەمێکی لێ دەخۆم، هێشتا لە بیرمە بەساردی دایانمێ، ئازیزم سواریس، بەڵام دەزانیت، لەو

---

[١٧] دیارە مەبەستی مەتبەخی پورتوگاللییە. (و.ک)

ساتەدا، من خۆم نەبووم، بەڵکو ئەلفارۆ دو کامپۆس جێگای گرتبوومەوە.

پێسەوا هەریسەکەی بە پەلە تەواوکردو پارچەیەکی بچوکیشی لە ورگە- گاکە تام کرد. وتی:

بەتامە، بەڵام تکات لێدەکەم ئاغای سواریس، تۆ بیخۆ، من دڵنیام ئەمڕۆ نانی نیوەڕۆت نەخواردووە.

لە ڕاستیدا، هیچ نانی نیوەڕۆم نەخواردووە، بێرناردۆ سواریس وەڵامی دایەوە، نەمدەتوانی خۆشیی پارە دانی دوو ژەمە خۆراک بە خۆم ڕەوا ببینم، تەنها پارەی ژەمەکەی تۆمدا، هەربۆیە لەبەر خاتری تۆ دەیخۆم.

بێرناردۆ سواریس سینییەکەی خستە بەردەمی خۆی و ورگەکانی لووشدا. وتی:

ئەمە وام لێدەکات تاسەی ئەو شەوانە بکەم، پێکەوە لە چێشتخانەی پێسەوا شێومان دەخوارد، من دڵنیام تۆ ئەو چێشتخانەیەت بۆیە هەڵبژاردبوو، چونکە بە ناوی خۆتەوە بوو، لە ڕاستیدا، چێشتخانەیەکی خاکی بوو، کە هەرگیز کەسانی وەک تۆ، ناچن بۆی.

پێسەوا بەرپەرچی دایەوە: ئەوە ڕاست نییە، من چێشتخانە خاکییەکانم خۆشدەوێت، من هەمیشە ژیانێکی خاکی ژیاوم، بەڕاست پێم بڵێ، هێشتا بیر لە سەمەرقەند دەکەیتەوە؟

بێرناردۆ سواریس وتی: کەمێک فێری زمانی ئۆزبەکی بووم، ئاوا، بۆ بێ تاقەتی خۆم، تەنانەت ئەگەر نەشتوانم بچم بۆ سەمەرقەند، بەڵام بەراستی زانینی زمانی ئەو ناوچەیە، وام لێدەکات هەست بکەم نزیکم لەو شارەی بە درێژایی تەمەنم خەونم پێوە بینیوە.

ئەی ئاغای فاسکیسی خاوەن کارەکەت؟ پێسەوا پرسی.

ئاه! بێرناردۆ سواریس وەڵامی دایەوە، ئەو پیاوێکی ئازایە، ئەو پیاوێکە بێ میتافیزیکا، وەک تۆ دەتوت، بەڵام پیاوێکی میهرەبانە تا ئەوەی ڤێلاکەی دامێ هەفتەیەک مۆڵەتم تیا بەسەر برد.

دەی ئەمە لە کوێ؟ پێسەوا پرسی.

بێرناردۆ وەڵامی دایەوە: لە کاسییە، لەسەر ئەو ڕێگایەیە کە دەچێتەوە گینشۆ.

کاسییە، پێسەوا وای وت، کاسییە، ئای لەو شوێنە جوانە، هەروەها منیش، چەند ڕۆژێکم لەوێ بەسەر بردووە، زیاتر لە دوو هەفتە نەدەبوو، ئەمە یەکەم جارە لەبارەی ئەوەوە بۆ کەسێک بدوێم، بە خۆشحاڵییەوە دانپێدانانێکت بۆ دەکەم، تۆ ئەی هاوڕێم، ئەی سواریسی ئازیز، من چووم بۆ ئەوێ تا لە کلینکی کاسییەی دەروون پشکنینم بۆ بکرێت. لەوێ ئەنتۆنیۆ مورام ناسی -فەیلەسوفە پانینیزم[18]-ەکە، دەبێ ئەوەش بڵێم من لەو شارە بچوکەدا، ڕۆژە هەرە ئارامەکانی ژیانم بەسەر برد، چونکە شەپۆلێکی ڕەش پەکیخستم و هەڵیگرتم و تەنها حەزم بە مردن دەکرد، بەڵام ئەنتۆنیۆ مورام ناسی کە متمانەکردن بە سروشتی دامێ.

ئەنتۆنیۆ مورا؟ بێرناردۆ سواریس پرسیاری کرد، هەرگیز لەبارەیەوە قسەت بۆ نەکردووم، حەزدەکەم شتێکی لەبارەوە بزانم.

پێسەوا وتی: زۆر باشە، ئەنتۆنیۆ مورا شێتە، لانی کەم،

---

١٨ Panentheism: واتا «گشت لە خودادا». باوەڕدارانی ئەم ڕێبازە پێیان وایە خودا لە هەموو شوێنێکی گەردوونی مادییدا بوونی هەیەو بەشێکە لێیو خالقییەتیو وزەشێتی. پەیوەندی بە ڕێبازی (وحدة الوجود)هوە هەیە.

ئەو شتێکی فەرمییە، بەڵام شتێکی عەقڵ ڕوونە، زۆر بیری لە بتپەرستی[19] و مەسیحیەت کردەوە، دەتوانم پێت بڵێم ئەو جلێکی لەبەر دەکرد هەر بەوەی دەکرد کە ڕۆمانییە کۆنەکان لەبەریان دەکرد، پۆشاکێکی سپی دەگەیشتە سەر پێیەکانی، هەروەها نەعلێکی لەسەر شێوازی کۆن لە پێ دەکرد، کەم دوو بوو، بەڵام قسەی لەگەڵ من کرد.

بێرناردۆ سواریس پرسی: ئەی چی پێ وتیت؟

زۆر شتی پێوتم، پێسەوا وەڵامی دایەوە، پێی وتم، لە سەرەتادا، خواوەندەکان دەگەڕێنەوە، چونکە ئەم چیرۆکی یەک ڕۆحە و چیرۆکی یەک خودایە، هیچ نین جگە لە شتێکی تێپەڕ و لەماوەیەکی کورتدا، کۆتاییان دێت، کاتێکیش خواوەندەکان دەگەڕێنەوە ئەم یەکانەییەی ڕۆح لە دەست دەدەین، ئیدی ڕۆحمان لە توانایدا دەبێت سەرلەنوێ ببێتەوە بە فرە، هەرچۆن سروشت ئارەزووی لەوەیە.

بێرناردۆ سواریس بەدەم گۆڕینی بابەتەکەوە وتی: ئازیزم پێسەوا، دەزانیت لەم ساڵەی دواییدا زۆرم بەدەست بێ خەوییەوە چەشت. لە هەموو بەیانییەکیش، لە کازیوەدا، لەبەردەم پەنجەرەکەمدا دەوەستام و چاودێریی پلەبەندیی ڕەنگم دەکرد بەسەر شارەکەوە، زۆرجار وەسفی کازیوەم کردووە بەسەر لیشبۆنەوە، شانازیش بەوەوە دەکەم، ئاستەمە نووسین لەبارەی ڕەنگ کردنی ڕووناکییەوە بەڵام من لەو باوەڕەدام سەرکەوتووبووم، تابلۆگەلێکم بە وشە کێشا.

هەرچۆن هۆبکنز وای کرد، پێسەوا پرسی.

بەڵێ، بێرناردۆ سواریس وەڵامی دایەوە، بەڵام بیرۆکەکەم دوای

---

[19] Paganism: بەگشتی کۆمەڵێک باوەڕی ئاینیو ڕۆحییەو سروشت یاخود فرە خواوەند دەپەرسترێت، (بت پەرستی).

خوێندنـەوەی یاداشـتە ڕۆژانەییەکانـی کیتـس بـۆ هـات، پاشـان تیۆرەی ڕوسـکین[٢٠] لەبـارەی (جیهانـیـ ڕەنگگـراو)[٢١]ەوە و هیـچ ڕێکەوتیـش نەبووە ئەگـەر لـە دەرئەنجامـدا ڕوسـکین بووبێتـە سـوارچاکی تورنـەر[٢٢]، منیـش وشـەکانم بـۆ تابلـۆ کێشـان وا بەکارهێنـا وەک ئـەوەی فلّچـە بـن، ڕەنگکراوەکەشـم کازیـوە و زەردەپـەڕی لیشـبۆنە بـوو.

پێسەوا وتی خۆرئاوابوونیش لە کاسییە شتێکی جوانە.

بـە دروسـتی ئەمـە ئـەو شـتە بـوو حـەزم دەکـرد لەبارەیـەوە قسـەت لەگـەڵ بکـەم، بێرنـاردۆ سـواریس درێـژەی پێـدا، لـە کاسـییە، بـە ئەزمونێکـی جوانیناسـی هەسـتام و لەنـاو کتێبـی (کتێبـی نائارامی)شـدا دامنـا.

پێسەوا وتی لەو بارەیەوە بۆم بدوێ.

بێرنـاردۆ سـواریس وتـی زۆر باشـە، لـە ڕاسـتیدا خـاوەن کارەکـەم، ئاغـای فاسـکیس، ڤێلایەکـی لـە کەنـار دەریـا بـە دەسـت بـوو، کـە کۆمپانیاکـەی (لافاسـکیس و مۆدیـکا) دەیدایـە، بـەو شـێوەیە، لوتفـی لەگەڵمـدا نوانـد، بـەوەی ڕێـگای پێـدام چەنـد ڕۆژێکـی تێـدا بەسـەر بـەرم، تەنانـەت ڕێـگای بـە شـۆفێرەکەیدا هاوەڵیـم بـکات، بـۆ مـاوەی چەنـد هەفتەیـەک بەتەنیـا لـە ڤێلایەکـدا ژیـام کـە لـە سـێ ژوور پێکهاتبـوو، وای! کـە شـتێکی جـوان بـوو.

پێسەوا پێداگیری کرد: بە وردی هەموو شتێکم پێ بڵێ.

---

٢٠ جۆن ڕوسکین (١٨١٩-١٩٠٠) ڕەخنەگری هونەری، نووسەر و شاعیری ئینگلیز. (و.ک)

٢١ لە ئیسپانییەکەدا word-painting. (و.ک)

٢٢ ولیـەم تورنـەر (١٧٧٥- ١٨٥١) وێنەکێشـی ئینگلیـز، کـە گرنگـی بـە ڕووناکـی دەداو وەک بابەتـی وێنەکێشـان سـەیری دەکـرد، جـۆن ڕوسـکین لـە ٢٤ سـاڵیدا زۆر لەسـەر تورنـەری دەنوسـیو بەرگـری لـە هونەرەکـەی دەکـرد تـا مەزنییەکـەی بسـەلمێنێت. خەڵاتێـک هەیـە بەنـاوی تورنـەرەوە لـە بەریتانیـا. (و.ک)

بێرنـاردۆ سـواریس وتـی: بەیانییەکـی خۆرەتـاو ڕۆشـتین، کـەش و هـەوا سـارد بـوو، بـەڵام ڕۆژێکـی خـۆش بـوو. سیباستیۆشم لەگـەڵ خـۆم بـرد، تووتـی کرێـکاری خەڵوزەکـە، کـە لـە سـەرەتای شـەقامەکە دەژی، تـۆ دەیناسـیت، ئـەو توتییـەک بـوو دەیزانـی چەند وشـەیەک بڵێـت، تەنانـەت ڕسـتەی تەواویـش. لـەو بـاوەڕەدا بـووم دەتوانێت هاوڕێیەتیم بکات. لـەوێ، لـە خانووەکـە، بالکۆنێکی نایاب هەبـوو بەسـەر زەریاکـەدا دەیڕوانـی، کـە شـوێنی هەڵنیشـتنەکەی سیباسـتیۆی لـێ هەڵواسـرابوو، بـەڵام مـن زنجیرەکەیـم کـردەوە، لێـی گـەڕام بـای باڵـی خـۆی بـدات و ئـازاد بێـت. بـە ڕۆژ دەچـوو لەسـەر درەختەکانـی باخچەکـە هەڵدەنیشـت و لـە خۆرئاوابوونـدا دەگەڕایـەوە سـەر شـوێنی هەڵنیشـتنەکەی خـۆی. ئەمـەش دروسـت کاتێـک ڕووی دەدا، کـە لـە بالکۆنەکـە بـە وشـە هەندێـک لـە دێـڕە شـیعرەکانتم وێنـە دەکێشـا، دێـڕە سـەرەتاکانی شـیعری (دوکانـی تووتـن): «مـن هیچ نیـم و هەرگیـز ناشـبم بـە هیـچ/ ناشـتوانم تەمەناکـەم شـتێک بـم...».

تووتیەکـە دەسـتبەجێ شـیعرەکەی لەبـەر کـرد، ئیـدی ئـاوا شـەومان دەگوزەرانـد، مـن وەسـفی خۆرئاوابوونـم لەسـەر بـەرد و بەسـەر زەریـاوە دەکـردو دەمـووت: سیباسـتیۆ، دەی. ئـەو بەیتەکانـی (دوکانـی تووتـن)ی دەوتـەوە، لەکاتێـکدا مـن وەسـفی ڕووناکیـی پەمەیـی کاڵ و هـەورە وەنەوشـەییەکانم لـە ئاسـۆدا دەکـرد، لـەو کاتـەی ئـارەزوو دەیخواسـت.

پێسـەوا وتـی: مایـەی پێکەنینـە، مـن لەپێنـاو مرۆڤـی ئـەم جیهانـەدا نووسیم، کەچـی تەنهـا تووتییـەک دەزانـێ دێـڕە شـیعرەکانم بڵێتـەوە.

بێرنـاردۆ سـواریس وەڵامـی دایـەوە: وا مەڵـێ، ڕۆژێـک دێـت، هەمـوو ئـەو مرۆڤانـەی خـاوەن دەروونێکـی گـەورەن، بـە شـیعرەکانت ئاشـنا بـن، لـە غەیبـەوە و لـە هەمـوو زمانەکانیشـدا، دەزانیـت، سیباسـتیۆ

ڕۆحێکی مرۆڤانەی هەیە، ئەو تووتی نییە، ئەو سروشی خواوەندە، من دڵنیام لە ناوەوەیدا ڕۆحێکی دەلفی[٢٣] دەژی، ئەو پێشبینی داهاتوو دەکات، هەست بەوە دەکەم.

پێسەوا پرسی: دوای ئەوە؟

دوای ئەوە، دەبێ ئەوە بڵێم ڕۆژانێکی زۆر جوان بوون. بەڵام کارەکەش لەناو ڤێلاکەدا ئاسان نەبوو، چونکە گەرم نەبوو، سەرباری ئەوەش جگە لە چرای نەوت هیچی ترم لەلا نەبوو، لە ئێوارەشدا، بەتایبەت لە ئێوارەدا، هەستم زۆر بە خەمۆکی دەکرد. بەڵام لەگەڵ کەسێکی میهرەباندا بووم بە هاوڕێ، ئەویش ئاغای دۆن پێدرۆکاسییە. ئەو پیاوێکی ڕەبەنە و وەک بەڕێوەبەری بانک کاردەکات، ئەو کەسێک بوو دەیتوانی لەبارەی زۆر بابەتەوە لەگەڵتدا بدوێت، بەشێوەیەکی تایبەت، حەزیشی لە زۆرانبازیی گایە لەسەر شێوازی پورتوگالی. لەگەڵ خۆشیدا بۆ بینینی خولێک بردمی.

یەکەمجار. ڕەتم کردەوە چونکە دەترسام نمایشێکی خوێناوی ببینم، بەڵام ڕام گۆڕی، چونکە نمایشەکە هیچ خوێناوی نەبوو، گاکەیان نەکووشت، تۆ ئەوە دەزانیت، پێسەوای ئازیز، زۆرانبازی گایەکە جوڵەیەکی ڕەمزیی بەدەستی دەکات، دوای ئەوەی بە سەما ئاژەڵەکەی گێژ کردووە، لەو ساتەدا، مێگەلێک مانگا دێنە ناو مەیدانی یارییەکەوە، ئیدی گاکەش تەکیان دەکەوێت و لەگەڵیان دەڕوات. بەڵام دەبێت تۆ شیک پۆشیی سوارە کەشخەکان ببینیت بەو پۆشاکانەیانەوە کە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی هەژدە، زینی ئەسپەکان و گوریسەکانیان بە دەوری گاکەوە، سەرئەنجام،

---

٢٣ عەرافێکە لە پەرستگای دەلف، بەناوی ئەپۆلۆنەوە پەرجوو دەکات.

نمایشـێکە بیـر ناچێتـەوە، بـەڵام مـن نامەوێـت وەڕسـت بکـەم.

پێسەوا داوای کرد: دەی شتێکی تریشم بۆ باس بکە.

بێرنـاردۆ سـواریس وتـی: زۆر باشـە، ئێوارەیـەک، ئاغـای دۆن پێـدرۆ بانگهێشـتی کـردم بـۆ ئێـوارە خوانێـک. خـۆی هـات تـا بـە ئۆتۆمبێلەکـەی بمبـات. ئۆتۆمبێلێکـی شـۆفەرلێتی ڕەشـی هەیـە، هەمـوو پارچەکانـی کانـزای بـە (کـرۆم) ڕووپـۆش کـراون، ئـەو ئۆتۆمبیلـە هـەر لـەوە دەچێـت کـە ئەلفـارۆ دو کامپـۆس بـەکاری دەهێنـا تـا بچێـت بـۆ ڕێـگای سـێنترا. ئـەو ئێوارەیـە، ڕەشـەبا بـوو، لقـی درەختەکانـی نـاو باخچەکـە بەیەکیانـدا دەکێشـا و منیـش جلـی ڕۆژی یـەک شـەممەوانم لەبـەر کردبـوو، لەکاتێکـدا ئاغـای دۆن پێـدرۆ چاکەتێکـی ئینگلیزیـی لەبـەر کردبـوو، پێـی وتـم: دەتبـەم بـۆ باشـترین چێشـتخانە لـە کاسـییە، کـە لـە بالکۆنەکەیـەوە، دەتوانیـت بەسـەر هەمـوو گوندەکـەدا بڕوانیـت، ئـاواش، دەتوانیـت وەسـفی هەمـوو کەنداوەکـە بـە هەمـوو ڕووناکییەکانییـەوە و هەروەهـا هەمـوو بەلەمـی ماسـیگرەکانیش بکەیـت. پێسـەوای ئازیـز، بـاوەڕم پـێ بکـە، چێشـتخانەکە زۆر دانسـقە بـوو، لـە ژیانمـدا شـتی وام نەبینیبـوو. کاتێـک گەشـتین، سـەرۆک گارسـۆنەکان پێشـوازیی لـێ کردیـن و شـەمپانیای ئەسـڵیی فەرەنسـی و گوێچکەماسـی پێشـکەش کردیـن، ئازیـزم پێسـەوا، تـۆ دەزانیـت، مـن هەرگیـز لـە ژیانمـدا، گوێچکـە ماسـیم نەخـواردوە. بـەڵام تـۆ، بـا، تـۆ خواردووتـە، لەوانەیـە لـە (تافاریـس) یاخـود لـە (لا برازیلییـرا دو کیـادۆ) خواردبێتـت، شـتێکی بەتامـە، دەوترێـت ئێمـە لـە ڕێـگای ئـەوەوە دەریـا دەمژیـن، تەنانـەت مـن بیـرم لـە نووسـینی دەقێکـی کـورت لەبـارەی تـام و بۆنەکەیـەوە کـردەوە، منێـک کـە جگـە لەبـارەی بینینـەوە نەبێـت نانووسـم، پاشـان ئاغـای دۆن پێـدرۆ بـە سـەرۆکی گارسـۆنەکانی وت (لاگۆسـتا سـۆیادا)مان

بۆ بێنە، بەڵام ئەمەی بە فەرەنسی وت، ڕۆبیانی عەرەق کردوو، لەسەر شێوازی خەڵکی پێنیش، با بشزانیت من هەرگیز لە ژیانمدا تامی توێکڵدارەکانم[٢٤] نەکردبوو، بەڵام ئاغای دۆن پێدرۆ باسی چۆنێتی شێوازی ئامادەکردنەکەی بۆ کردم و منیش دەمەوێت بۆت باس بکەم، ئیدی ئاوا، کاتێک باش دەبیت، خوشکەکەت دەتوانێت بۆت ئامادە بکات. پێویستت بە کەرە، سێ سەلک پیاز، تەماتە، کەمێک سیر، ڕۆن، شەرابی سپی، ئەگواردێنتی[٢٥] کۆن، ئەوەی کە زۆر حەزت لێیەتی، دوو پەرداخ لە پۆرتۆی وشک، تۆزێک بیبەر، داودەرمان و گوێز دەبێت. سەرەتا، دەبێت ڕۆبیانەکە بە هەڵم بکوڵێنیت -نیوە کوڵاو-. پاشان ئەو داودەرمانانەی تێدەکەیت کە بۆم باس کردیت، پاشان دەیخەیتە فرنەوە. بەڵام بۆ پێی دەوترێت عارەقکردوو، ئەوا من نازانم، لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە چەورییەکی کەمی خۆش مەزە دەردەکات. ڕاوچییەکانمان لە پێنیش -کە خۆشخۆر و چڵێسن- بەم شێوەیە ئامادەی دەکەن، منیش پێشتر خواردنێکی خۆش و کەمی ئاوام نەخواردووە. دوای ئەوە، دۆن پێدرۆ پەرداخێک بۆرنۆی خۆش مەزەی دامێ و چووین تا لە بالکۆنەکە بیخۆینەوە. ڕووناکییەکانی کەنداوی کاسییە لە ژێرمانەوە بوون. ئای پێسەوای ئازیز، ئەوە چەند جوان بوو. ئاغای دۆن پێدرۆ باسی گەشتەکانی خۆی کرد بۆ سیبیلییە، منیش باسی ئەو گەشتەم بۆ کرد کە هەمیشە خەونم پێوە بینیوە، بۆ سەمەرقەندی بکەم و پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد کتێبی فێربوونی زمانی ئۆزبەکیم لێ بخوازێت. بە ڕێز و خۆشەویستییەوە

٢٤ ئەو ئاژەڵانەی ئێسکە پەیکەریان نییەو ڕووی دەرەوەیان بەرگێکی ڕەقی هەیە، وەک قرژاڵو ڕۆبیانو زیندەوەری سەدەفی.

٢٥ جۆرە خواردنەوەیەکی کحولییە. (و.ک)

بۆم پێکەنی و وتی: سەمەرقەند! بیرۆکەیەکی چەند نایابە، ئاغای بێرناردۆ سواریس، بەڵام من هەرگیز نیوە دوورگەی ئیبریا[٢٦] جێناهێڵم، ئەو تۆزەی لە زمانی ئیسپانی دەیزانم، کەمێکیش لە زمانی ئینگلیزی، کاتێک هاوڕێکانم لە لەندەنەوە دێن و دەیانبەم بۆ یاری بلیارد لە (لاکازا دو ئەلیینتیخۆ) لە لیشبۆنە، بەشم دەکەن. کتوپڕ ڕووناکیی سەر باخچەکە، کە دەکەوتە کەناری دەریاکەوە، کوژایەوە. لە کەنداوەکەش، جگە لە چەند ڕووناکییەکی کز، کە ڕووناکی بەلەمی ماسیگرەکان بوون، هیچ نەما، ئاغای دۆن پێدرۆ پێی وتم: بەڕێز بێرناردۆ سواریس دەتگەیەنمەوە بۆ ماڵەوە. لە ڕێگاش، باسی هەڵهاتنی خۆر و ئاوابوونیم کرد. هەستم بە خۆشی کردو بیرم کردەوە: فەسڵێکی خۆش لە پێناو ڕۆژە ناخۆشەکانم بنووسم. ئاغای دۆن پێدرۆ هەر سەنگین مایەوە و زۆربلێییەکەمی پێ نەدەبڕیم. لای درەختە چەماوەکانی باخچەکە بەدەم باوە، دابەزیم و پێموت: سوپاس ئاغای دۆن پێدرۆ، یەکێک لە خۆشترین شەوەکانم لە ژیاندا بەسەر برد. ئەویش پێی وتم: من دەبێت سوپاست بکەم، بێرناردۆ سواریسی ئازیز، شەرەفێکی گەورەیە بۆ من کە یەکێک بم لەو یەکەمینانەی یاداشتە ڕۆژانەییەکانت دەخویننەوە، هەرگیز بیریشت نەچێت من زۆر سەرسامم بە فێرناندۆ پێسەوا، ئەمەی پێ بڵێ، چونکە ئەو خۆی نیشانی کەس نادات و مەحاڵە منیش بتوانم ئەمەی پێ بڵێم هەربۆیە بە تۆی دەڵێم، ئەی فێرناندۆ پێسەوای ئازیزم، من سڵاو و سەرسامیی ئاغای دۆن پێدرۆم بۆ هێناویت.

فێرناندۆ پێسەوا بە پێکەنینێکی ماندوانەوە، وتی: سوپاس.

---

٢٦ نیوە دوورگەی ئیبریا: بە پورتوگالو ئیسپانیا دەوترێت. (و.ک)

فێرناندۆ پێسەوا جارێکی تر دەسماڵەکەی خستەوە سەر سنگی.

بێرناردۆ سواریس وتی: ئاغای پێسەوا، دەترسم ئا بەم هەموو زۆربڵێییانەم ماندووم کردبیت، بمبوورە، لەوانەیە بێزارم کردبیت.

هەرگیز، پێسەوا بە لاوازییەوە وەڵامی دایەوە، قسەکردنم لەگەڵ تۆ خۆش بوو، بەڵام لەو باوەڕەدام میوانی دیکەم بێت. سواریسی ئازیز، سەردانیی کەسێک کە لەم ڕۆژانەی دواییدا کەمێک پشتگوێم خستبوو. بۆ کتێبەکەت (کتێبی نائارامی) جوانترین هیوات بۆ دەخوازم.

***



۳۰ی تشرینی دووەمی ۱۹۳۵

# منیش مردنم بیرچووەوە

ئـەو پیـاوەی هاتــە ژوورەوە پیرێکـی سەروسـیما خانــەدان بــوو، ڕیشـێکی زۆر سـپی هەبـوو، جلێکـی ڕۆمانــی لەبـەردا بـوو تـا سـەر پێیەکانــی هاتبــوو، ئەویـش هــەر سـپی بــوو.

سـڵاو، ئـەی هـاوڕێ، پیرەکـە وای وت، مـن ڕێگـە بـە خـۆم دەدەم بێمــە خەونەکانتــەوە.

پێسـەوا گڵۆپـی سـەر دۆڵابەکـە داگیرساند، سـەیری پیـاوە پیرەکـەی کردو ناسـییەوە: ئەنتۆنیـۆ مـۆرا بـوو، ئامـاژەی بـۆ کـرد نزیـک بێتەوە.

مـۆرا دەسـتی بـەرز کـردەوە و وتـی: فلیپاسـی فینیقی[27] -کـە بـەر لـە پـازدە سـاڵ مـرد- قیـژەی نـەورەس و شـەپۆلی دەریـا قوڵەکانـی بیـر چـوەوە، تـا نهێنـی چارەنووسـی تـۆم پێبڵێـت، ئـەی فێرنانـدۆی مـەزن. دەزانـم ئـاوی ئاشـیرۆن[28] چاوەڕوانتــە، پاشـان تۆفانـی گـەردە تـووڕەکان کـە هەمـوو شـتێک تیایانـدا ون دەبێـت و تیایانـدا هەمـوو شـتێک سـەرلەنوێ دادەهێنرێتــەوە، لەوانەیــە تــۆ بگەڕێیتــەوە، وەک گوڵێـک لـە باخچەکانـی لیشـبۆنە کـە لـە ئەپریلدا چرۆ دەکات، یاخـود لەوانەیـە وەک بارانێـک بەسـەر جـۆگا و دەریاچەکانـی پورتوگالـدا،

---

٢٧ لای فینیقییـەکان وێنەکـەی فڕێدەدرایـە دەریـاوە، بـۆ نـوێ بوونـەوەی ژیـانو دەسـتپێکردنەوەی خولێکـی تری ژیـان. (و.ک)

٢٨ ڕووباری عەدەم لە هادس جیهانی خوارەوە یاخود دۆزەخ. (و.ک)

منیش، منیش پیاسە دەکەم و گوێم لە دەنگت دەبێت گەماڕۆی با دەدات.

پێسەوا لەسەر ئانیشکی هەستا. ئێستا ئازاری لای ڕاستی نەماوە و لە ئێستاشدا هەست بەهیچ ناکات، جگە لە ماندوێتییەکی زۆر. لێی پرسی:

ئەی (گەڕانەوەی خواوەندەکان)؟

ئەنتۆنیۆ مۆرا وەڵامی دایەوە: کتێبەکە لە تەواو بووندایە، بەڵام نازانم ئەگەر بتوانم بڵاوی بکەمەوە، چونکە کەسێک نییە بوێرێت کتێبەکانی شێتێک بڵاوبکاتەوە.

پێسەوا درێژەی دایە: پێم بڵێ، کاروبار لە کلینیکی کاسییەی دەروون، کە بۆ ماوەیەک یەکمان تیا بینی، چۆن دەڕوات.

ئەنتۆنیۆ مۆرا وەڵامی دایەوە: باش دەزانیت، دەستنیشان کردنی نەخۆشییەکەم، پارانۆیا[29] لەگەڵ نیورۆسیسی[30] دەروونی پچڕپچڕ بوو، بەڵام لە شانسی من، دکتۆر گاما لەوێ بوو، کە حەزی دەکرد گوێم لێ بگرێت: ئەو کەسێکی زۆر ئازادە، ئەویش باوەڕی بە گەڕانەوەی خواوەندەکانە و بەرگری لەو بیرۆکەیە دەکات کە شێتی بابەتێکە مرۆڤ دایهێناوە تا ئەوانە گۆشەگیربکات کە کۆمەڵگا وەڕس دەکەن. منیش کۆمەڵگای کاسۆلیکی و کڵێسا بێزار دەکەم، چونکە من مژدەی گەڕانەوەی خواوەندەکان دەدەم، پێسەوای مەزن، تەنها تۆیت دەتوانیت یارمەتیم بدەیت، بەڵام تۆش، لە ئێستاوە لە ئاشیرۆن دەپەڕیتەوە و منیش لە شێتخانەیەکدا خۆم

---

٢٩ paranoia : نەخۆشییەکە بەمانای هەست بەچەوسانەوەکردن یا خوو بەچەوسانەوەگرتن دێت، یان بەمانایەکی تر پارانۆیا واتا متمانە نەبوون بە هەموو شتێک بەهەموو کەسێك بەهەموو ڕوداوێك. (و.ک)

٣٠ Neurosis: نەخۆشیی عوساب. (و.ک)

تەنیا دەبینمەوە، کەسیش ناتوانێت نووسینەکانم بڵاوبکاتەوە.

پێسەوا پێکەنی، بە ئەدەبەوە سەری خستە سەر سەرینەکەی و بە جوڵەیەکی دڵنیاکەرانە ئاماژەی کرد. وتی:

ئەنتۆنیۆ مۆرای ئازیز، هەموو ئەو نووسینانە، کە ئەو ڕۆژەی لە کلینیکی کاسییەی دەروون یەکمان بینی، پێتدام، لەناو سنوقێکدا پاراستوومە، سنوقێک پڕ لە خەڵک[31]. لە ئێستاشەوە، کەسەکان بە زەحمەت تیای دەمێننەوە، بەڵام کتێبەکەت (گەڕانەوەی خواوەندەکان)، هەرگیز ون نابێت. ڕۆژێک دێت لەلایەن زۆرینەوە پەی پێ ببرێت، تەنانەت —بەوپێیەی ئەمڕۆ توانای پێشبینی کردنم هەیە— دەتوانم پێتبڵێم ڕەخنەگرێکی گەورە کەشفی دەکات، ئەویش پیاوێکی پڕ لە هەست و سۆز و ڕۆشنبیرییە و ناوی کۆیلهۆیە.

ئەنتۆنیۆ مۆرا پرسی: وەک کۆیلهۆ باشیکۆ؟

پێسەوا وەڵامی دایەوە: ئەو جیاوازە، زۆر جیاوازە. پیاوێکە شیعر نانووسێت، بەڵام کاری لێکۆڵینەوە دەکات، ئەو پیاوێکی کەللەڕەقە لە کردنەوەی ڕەمزی ناو نووسینەکانی تۆو منیشدا سەرکەوتوو دەبێت، پیاوێکە خاوەن بەهایەکی مەزنە و بە جیهانمان دەناسێنێت.

ئەنتۆنیۆ مۆرا پرسی: لە چ شوێنێک لە جیهاندا؟

پێسەوا وەڵامی دایەوە: لە جیهاندا.

ئەنتۆنیۆ مۆرا هەنگاوێک چووە پێش و بەچۆکدا هات:

پێسەوای ئازیز، سەبارەت بە دۆزەکەت، چیم پێدەڵێیت سەبارەت بە دۆزەکەت، مانەوەت چۆن بوو لە کلینیکی کاسییە بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان؟ من سەرسوڕماوم، چونکە دوای ئەوە نەمبینیتەوە،

٣١ کتێبێکی ئەنتۆنیۆ تابوکییەو بریتییە لە لێکۆڵینەوەو وتار لە بارەی ژیانو ئەدەبی پێسەواوە.

ئایا جیایان کردیتەوە؟

پێسەوا هەناسەیەکی هەڵکێشا. وتی:

دەبێت دان بەوەدا بنێم، من داخڵی نەخۆشخانە نەبووم. ئارەزووم لەوە نەبوو. پێم باشتر بوو چەند هەفتەیەک لە خانوویەک بەسەر بەرم کە بەسەر کەنداوەکەدا دەڕوانێت، لە شەقامی (داسوداد)، لای خانمێک کە گرنگی پێدەدام، ئەو بێوەژنە، لەگەڵ دوو کچەکەیدا دەژی، ئەوان دوو منداڵی ژیکەڵەن، ژنەکە هەندێک ژەمی کەمی سەیری لە نیوەڕۆو ئێوارەدا، بۆ ئامادە دەکردم. بەڵام، لە قوڵاییدا، بۆ نا، ئازیزم ئەنتۆنیۆ مۆرا دەمەوێت بۆت وەسف بکەم، دەی با بزانیت، هەمیشە، بۆ نیوەڕوان، ماسی بە فڕن لێنراو یاخود برژاو لەگەڵ شەرابی کۆلاریسی سپی، لە ئێوارەشدا، ئای لە ئێوارەدا، شێوەکە خوانێکی ڕاستەقینە بوو. هەمیشە شۆربای یەنتیجانا یاخود کالدۆفێردی، پاشان، ئەندێشەی بکە، ماسییەکی مۆرە بە فڕن و (بیسکادیناس دو ڕابۆ نابۆکا)و چەندین دەفری بچوکی بە تام. ژوورێکم درابوویە بەسەر کەنداوەکەدا دەیڕوانی، لە ڕاستیدا خۆی هۆڵێک بووە بە دووکەڵکێشێکەوە، بەڵام بە مەبەست، کرابوو بە ژوورێکی نووستن. لە ئێوارەدا، تیای دەمامەوە، لە بالکۆنەکەدا، لە کەنداوی کاسییە و ئەستۆریلم دەڕوانی، لە ڕادیۆکەشەوە گوێم لە ئاوازی سەمائامێز یاخود هەندێک گۆرانیی کۆنی (ناوچەی) کوامبرا دەگرت، هەستم بە بەختەوەری دەکرد.

ئەو خانمە ناوی چییە؟ ئەنتۆنیۆ مۆرا پرسیاری کرد.

ناوەکەی هیچ بایەخێکی نییە، پێسەوا وەڵامی دایەوە.

ئەنتۆنیۆ مۆرا وتی: من ئیرەییت پێدەبەم، بەڕاستی من ئیرەییت پێدەبەم، ساتی بەختەوەرییت هەبووە، پێم بڵێ، لە چارەسەرکردنەکەدا

سەرکەوتوو بوویت؟

پێسەوا وتی: باشە، بەدیاری کراوی لەوکاتەدا، شەپۆلێکی ڕەش دای لەسەرم، دەزانیت، نەمدەزانی چی بکەم، خۆم وەک شێت دابنێم یاخود خۆم فڕێ بدەمە ڕووباری تاجەوە. پێویستم بە خێزان هەبوو، بە کەسێک گرنگیم پێ بدات، بە میهر و سۆزەوە مامەڵەم لەگەڵ بکات. لەم خێزانەدا ئەو پەناگایەم دۆزییەوە، پاشان، کاتێک بە تەنیا دەمامەوە، چونکە هەندێک کات بە تەنیا دەمامەوە لە ماڵەکەدا، سەگێکی لێ بوو، سەگێکی ڕەشی جوان ناوی جۆ بوو، (بندوق) زۆر زیرەک بوو، شیعرە ئێزۆتیرییەکانم[٣٢] بۆ دەخوێندەوە و دڵنیابووم لەوەی، ئەو سەگە، ڕۆحی خواوەندە میسرییە کۆنەکانی دۆناودۆن کردووە، پەلەکانی خۆی لەسەر کاشییەکە دەخوراند و کێشی شیعرەکانمی بۆ پارچە پارچە دەکردم. لەمیانەی ئەم کەرت کردنە شیعرییە، شێتانە و خواوەندانەییەوە، کێشی شیعرەکانم ڕێکدەخست، دەمگۆڕین بۆ مۆسیقا. دوای ئەوە، بۆ دانیشتن دەچووم بۆ بالکۆنەکە و کەنداوەکەم دەبینی، بەلەمی ماسی گرەکانم دەبینی کە دەمەو بەیانی دەگەڕانەوە، گوێم لە دەنگی ئەو دەریاوانانە دەبوو کە بە خۆشییەوە یەکتریان بانگ دەکرد، بۆنی قەتران و تۆڕی ماسیگرەکانم هەڵدەمژی و هەموو شتێک جوان و کۆن بوو، ئیدی لەم ڕێگایەوە چاک بوومەوە، مردنم بیرچووەوە و سەرلەنوێ گەڕامەوە بۆ ژیان.

هەروەها منیش مردنم بیرچووەوە، ئەنتۆنیۆ مۆرا وای وت،

---

٣٢ وشەکە لە بنچینەدا یۆنانییە، واتای نادیار و تایبەت دەدات، ئێزۆتیریک بە عەرەبی پێی دەڵێن العلوم الباطنیة. (و.ک)

چونکە من باوکە لۆکریسم خوێندەوە، ئەوەی گەڕانەوەی ژیانی[٣٣] لە ڕژێمی سروشتدا زانی و تێگەشتم هەموو ئەو گەردانەی پێکی دەهێنن ئەم تایبەتمەندییە ناکۆتا بچوکانەی ئەم جەستەیەی ئێستامان پێکدەهێنن، دوای ئەوە لە سووڕە ئەبەدییەکەدا دەگەڕێنەوە و ئاو، زەوی، بەروبوومە گەیوەکان، ڕووەک، ئەو نورەی بینایی دەبەخشێت، ئەو بارانەی تەڕمان دەکات، ئەو هەوایەی دەمان شەکێنێت، ئەو بەفرە سپییەی لە زستاندا بە پاڵتۆکەی دەمانپێچێتەوە. ئەی پێسەوا، ئەی مەزن، بە زۆر شێوەی جیاواز کە سروشت دەیەوێت، هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ زەوی، لەوانەیە، ببیتە، سەگێک ناوی جۆیە، گەردی لکە گیایەک یاخود دەماری[٣٤] کچۆڵەیەکی ئینگلیز، کە بەسەرسامییەوە سەیری یەکێک لە گوڕەپانەکانی لیشبۆنە دەکات. بەڵام تکات لێ دەکەم، هێشتا کات زووە بۆئەوەی جێمان بهێڵیت، کەمێکی تر لەنێوماندا بە سیفەتی فێرناندۆ پێسەوا، بمێنەرەوە.

پێسوا ڕوومەتی خستە سەر سەرینەکە و بە ماندووییەوە زەردەخەنەیەکی کرد. وتی:

ئازیزم ئەنتۆنیۆ مۆرا، بڕۆسیربین لە مەملەکەتەکەی خۆی دەیەوێم، ئێستا کاتی ڕۆشتنە، ئێستا کاتی بەجێهێشتنی شانۆی ئەم وێنانەیە کە پێی دەڵێین ژیان. ئەگەر تۆ ئەو شتانەت دەزانی من لە میانەی چاویلکەکانی ڕۆحەوە بینیومن، لوتکەی

٣٣ لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە، پێیان وایە گەردون و مرۆڤ و هەموو شتێک دوای مردن و فەنابوونیان، سەرلەنوێ وەک خۆی دەخولقێنرێتەوە. هەموو شتێک جارێکی تر ڕوودەداتەوە. (و.ک)

٣٤ لە عەرەبییەکەدا وشەی (عرقوب) هەیە، بریتییە لەو ڕەگە ئەستورەی لەسەرو پاژنەی پێوە بەرەو پوز هەڵدەکشێت (فەرهەنگی شیرین).

ئۆریێنم بینیوە، لەو بەرزییەدا، لەو فەزا بێ کۆتاییەدا، بەم دوو پێ زەمینییەم بەسەر خاچی باشوردا ڕۆشتووم، شەوانی بێ کۆتاییم وەک نەیزەکێکی درەوشاوە بڕیوە، فەزا ئەندێشەکراوەکانی نێوان ئەستێرەکانم بڕیوە[٣٥]، شەهوەت و ترس، پیاو، ئافرەت، پیر، کچێکی بچوک بووم، حەشاماتی جادە زۆر و زەبەنەکانی پایتەختە گەورەکانی خۆرئاوابووم، سکونی بودای ڕۆژهەڵات بووم کە ئیرەیی بە ئارامیی، بە حیکمەتی دەبەم، من خۆم بووم و ئەوانی تریش، هەموو ئەوانەی دەمتوانی ببم بەوان، شکۆو شەرمەزاری، کەفوکوڵ و داهێزراویم ناسی، ئەو ڕووبار و چیایانەم بڕی کە گەشتن پێیان ئاستەم بوو، ڕان و مێگەلە ئارامەکانم بینی و خۆر و باران بەر سەرم کەوتن، مێ بووم لە گەرمادا، ئەو پشیلەیەش بووم لە شەقامدا یاری دەکات، خۆر و مانگ بووم، من هەموو ئەوانە بووم چونکە هەرگیز ژیان بەش ناکات. ئەنتۆنیۆ مۆرای ئازیزم، بەڵام لە ئێستادا، بەش دەکات. ئەو ژینەی ژیام وەک ئەزمونکردنی هەزاران ژیان وابوو. من شەکەتم، مۆمی ژیانم توایەوە، تکا دەکەم، چاویلکەکەم بدەرێ.

ئەنتۆنیۆ مۆرا جلەکەی ڕێک کرد. پرۆمیسۆس لە ناوەوەیدا گینگلی دەدا. هاواری کرد:

ئەی ئاسمانی خواوەند، ئەی بایە باڵدارە بزۆزەکان، ئەی سەرچاوەی ڕووبارەکان، ئەی بزەی شەپۆلە بێ ئەژمارەکانی دەریا، من لێتان دەپاڕێمەوە، ئێوە و ئەو خۆرەی هەموو شتێک دەبینێت، هەمووتان سەیر بکەن بزانن چ ئازارێک دەچێژم.

پێسەوا هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئەنتۆنیۆ مۆرا چاویلکەکەی

---

٣٥ ڕووداوی نێوان ئەستێرەکان.

لەسەر کۆمەدییەکە هەڵگرت و کردییە چاوی. پێسەوا چاوی کردەوە، دەستی لەسەر چەرچەفەکە لە جوڵە کەوت. کاتژمێر بیست و سێ و سی خولەکی تەواو بوو.

***

## • فێرناندۆ پێسەوا

دەوترێت ئەدەبی پورتوگالی چوار شاعیری مەزنی هەیە، ئەو (یش) فێرناندۆ پێسەوا (یە). دیارە ئەم قسەیە بۆ کەسێک فێرناندۆ پێسەوا نەناسێت، کەمێک تەمومژاوییە و ناتوانێت بە قووڵی لە مەغزا و جوانیی ئەم ڕستەیە تێبگات، بەوەی بڵێی چوار شاعیرەکە یەک ناویان هەبووبێت، یاخود هەر چواریان یەک کەس بوون؟

کاتێک فێرناندۆ پێسەوای شاعیری پورتوگالی، کە یەکێک لە شیعرە بەناوبانگەکانی (دوکانی توتن)ە، لە ٣٠ نۆڤەمبەری ١٩٣٥دا، مرد، پێچەوانەی نووسەرانی تر، ئەو ژیانی لەدوای مردنەکەیەوە دەستی پێکرد. بەوەی باوەڵێکی لەدوای خۆی بەجێهێشت، کە تا ئێستا، بە پڕ ڕازترین میرات دادەنرێت لە مێژوی ئەدەبدا و کردی بە ئەفسانە لە دنیای نووسیندا.

فێرناندۆ ئەنتۆنیۆ نۆگیرا لە ١٣ی یۆنیۆی ١٨٨٨ لە لیشبۆنە لەدایکبووە. ئەو کوڕی ماجدالینا بینییرۆ نۆگیرا و جواکیم دو سیبرا پێسەوا بوو. باوکی لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی شارەکەدا ڕەخنەگری میوزیک بوو. کاتێک پێسەوا تەمەنی پێنج ساڵان دەبێت، باوکی دەمرێت، دوای ئەوەی تووشی نەخۆشی سیل دەبێت. دیۆنیسیای نەنکیشی (دایکی باوکی) تووشی جۆرێک لە

شێتی مەترسیدار دەبێت و لە شێتخانە دەمرێت. لە ساڵی ١٨٩٥ دەڕوات بۆ دوربان لە باشوری ئەفریقا، چونکە دایکی شوو بە کونسوڵی پورتوگال دەکات لە باشوری ئەفریقا. هەموو خوێندنی بە زمانی ئینگلیزی دەبیت. بۆ ناو نووسین لە زانکۆ دەگەڕێتەوە بۆ پورتوگال، بەڵام خوێندن تەواو ناکات و لە لیشبۆنە دەژی.

لە ٨ی مارسی ١٩١٤دا ئەلبەرتۆ کایرۆ، یەکەم کەسایەتییە ئەلتەرناتیڤەکانی بەدەردەکەوێت و دواتر ڕیکاردۆ ڕەییس و ئەلفارۆ دو کامبۆسیشی بەدوادا دێن. ئەم جێگرەوانەی (ئەلتەرناتیڤ) (ئەوی دیکەی تربوون). دەنگ گەلێک لەناویدا دواون و ژیانی سەربەخۆی خۆیان دەبێت. پێسەوا هەموو نووسەرە پێشڕەوەکانی پورتوگال دەخولقێنێت، هەمیشە لە پەنسیۆن (ئوتێلی بچوکی هەرزانبایی) یاخود ژووری کرێدا ژیاوە. تەنها یەک خۆشەویستیی هەبووە لە ژیانیدا ئەویش لەگەڵ (ئۆفیلیا کویرۆز)، کە وەک چاپکەر لەسەر ئامێری چاپ، کاری کردووە لەو کۆمپانیای هەناردەکردن و هاوردەکردنەی پێسەوا کاری لێکردووە. خۆشەویستییەکی بەهێز و کورت بووە. پێسەوا لە ژیانیدا تەنها لە گۆڤارەکاندا نووسینی بڵاوکردۆتەوە، تەنیا کتێبێکی بڵاوکراوەشی لە پێش مردنەکەیدا، کتێبێکی بچوک بووە بەناوی (نامە)وە، کە چیرۆکێکی ئێزۆتیرییە لەبارەی پورتوگالەوە. لە ٣٠ تشرینی دووەمی ١٩٣٥دا، لە نەخۆشخانەی (قەشە لویسی فەرەنسی) لە لیشبۆنە بەهۆی نەخۆشیی جگەرەوە دەمرێت، کە پێدەچێت بەهۆی زیادەڕەوییەوە بووبێت لە کحولدا.

نامۆیی پێسەوا لەوەدایە، کە تا لەژیاندا بووە، بەردەوام و ڕۆژانە خەریکی نووسین بووە. بەڵام تەنها دیوانە شیعرێک بەناوی (نامە) بڵاودەکاتەوە. بەڵام دوای مردنی، باوەڵێک دەدۆزرێتەوە،

کە پێسەوا ژمارەیەکی زۆر نووسینی تێدا شاردۆتەوە. ئەو نووسینانەشی بەناوی کەسانی ترەوە نووسیوە و وەک شارەزایانی پێسەوا دەڵێن، نزیکەی ٢٧٥٤٣ دەقی تێدا دەبێت و تا ئێستاش لێیان ساغ دەکرێنەوە و بڵاودەکرێنەوە، کە لەم دواییەدا، یەکێکیان ڕۆمانێکی پۆلیسی بوو، بەناوی (دۆزی فارگاس) بڵاوکرایەوە.

سەیر و سەمەرەیی پێسەوا (ناوی ڕاستەقینەی -فیرناندۆ ئەنتۆنیۆ نۆگییرا-یە، بەڵام یەکێک لە ماناکانی ناوی پێسەوا، بریتییە لە هیچ کەس، چۆن لە کوردیدا ناوی بێکەس هەیە)، لەوەدایە کە ئەو، تەنها ناوی خوازراوی بەکارنەهێناوە، تا بیانکات بە دەمامک بۆ خۆی و لە ترسدا، یاخود لەبەر هەر هۆکارێکی تر، بەناوی ترەوە بنووسێت. بەڵکو ئەو کەسایەتییەکانی خوڵقاندووە و ژیاننامەی بۆ دروستکردوون، تەنانەت چاوپێکەوتنیان کردووە و نامەیان نووسیوە، شیعریان وەرگێڕاوە و ڕەخنەیان نووسیوە. هەرچۆن کەسێکی ڕاستەقینە دەیکات. لەپشت هەر ناوێکەوە، کەسایەتییەکی دروستکردووە، کە شێوە و بیروباوەڕو شێوازی نووسینی جیاوازە: چ لە پێسەوا خۆی، چ لە کەسایەتییەکانی تری. تەنانەت تیایاندایە گومان لە بوونی پێسەوا خۆی دەکات، وەک ئەلفارۆ دی کامپۆس. هەیانە سەر بە دنیای گوندە، هەشیانە ڕەشبینە و بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە. هەیانە باوەڕی بە ڕۆڵی زانستە لە پێشکەوتن و بەختەوەریدا...

لەنامەیەکدا کە ١٣ی کانونی دووەمی ١٩٣٥ بۆ ئەدۆلفۆ کاسایسی نووسیوە، پێسەوا دەڵێت: هەر لە منداڵییەوە، دەمویست جیهانێکی وەهمی لەدەوری خۆم دروستبکەم و دەوری خۆم بە هاوڕێ و ناسیاوانێک بدەم، کە هەرگیز بوونیان نەبووبێت.

لە هەشتی مارسی ١٩١٤دا، پارچە پارچە بوونی پێسەوا، یاخود

دابەشبوونی بۆ چەندین کەسایەتی تر ڕوودەدات. یاخود دەکرێ بڵێین لەو بەروارەدا، پێسەوا دەروازەکانی خۆی دەکاتەوە، تا چەندین کەسایەتی وەهمیی لێ بێنە دەرەوە. ئەویش دوای ئەوەی لەو ڕۆژەدا ٣٠ شیعر بەیەکجار و بێئەوەی پاکنووسیان بکات، لەژێر ناوی (شوانی مێگەل)دا دەنووسێت، لەوکاتەدا پێسەوا هەست دەکات ئەوەی شیعرەکانی نووسیوە، خۆی نییە، بەڵکو کەسێکی ترە، کە دەستبەجێ ناوی ئەلبەرتۆ کاییرۆی لێدەنێت. دوای ئەوە یەک بەدوای یەک، کەسایەتییەکانی تری دەخوڵقێنێت.

پێسەوا لە نووسینێکی دانپیانان ئاسادا بەناوی (ساتی شەیتان)، باس لەوە دەکات، کە لەساتی نووسیندا تارمایی یاخود ڕۆحی کەسێک دێتە ناوییەوە و ئیدی وەک ئەو و بەناوی ئەویشەوە دەنووسێت.

پێسەوا زۆر کەسی خوڵقاند، کە لەبواری جیاجیادا دەیاننووسی. وەک ئەوەی تەنها پێسەوا بەشی ئەوە نەکات تا گوزارشت لە خۆی بکات. لەو کەسایەتییە وەهمیانەی پێسەوا بەناویانەوە دەینووسی: شیڤالییە دی با، بە یەکەم کەسایەتی خوڵقێنراوی پێسەوا دادەنرێت، کە بە فەرەنسی نامەی بۆ پێسەوای تەمەن شەش ساڵ نووسیوە. دوای ئەو، چارلس ڕۆبەرت ئانون، کە بە ئینگلیزی دەینووسی. پاشان ئەلکسەندەر سێرچ. هەروەها ئەنتۆنیۆ مۆرای کۆمەڵناس و فەیلەسوف کە لەبارەی بت پەرستییەوە دەینووسی، ڕافائیل بالدایا کە گرنگی بە سیحر و غەیب دەدا و لە نووسیندا دەیویست ئەوە بسەلمێنێت، کە بوون وەهمە. تۆماس کرۆزی ڕەخنەگر و ئەکادیمیی پسپۆر لە شیعری ئەلبەرتۆ کاییرۆ وەرگێڕی شیعرەکانی کایرۆش بووە ( دیارە کاییرۆش کەسایەتییەکی وەهمی و دروستکراوی پێسەوا خۆی بوو). بەڵام

زیاد لە هەموو ئەو کەسایەتییە وەهمیانەی پێسەوا، چواریان زۆر بەناوبانگن، کە پێسەوا ژیاننامەی بۆ دروست کردوون، وەک ئەوەی کەسانی ڕاستەقینەبن:

- ڕیکاردۆ ڕەییس: (دیارە ئەم ناوە ڕاستەوخۆ دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ڕۆمانەکەی ساراماگۆ -ساڵی مردنی ڕیکاردۆ ڕەییس-). ڕیکاردۆ پزیشک و شاعیر دەبێت و وەک دوورخراوەیەک لە بەرازیل دەژی. شیعرەکانی ڕیکاردۆ، شیعرگەلێکی ئاسایین و زیاتر ڕەشبینی زاڵە بەسەریاندا.

- ئەلفارۆ دی کامپۆس: لە لەندەن دەژی و پیشەی ئەندازیاری دەریاییە. کەسێتییەکی گۆشەگیرە و کاریگەریی والت وایتمان و ئایندەخوازەکانی ئیتالیای بەسەرەوەیە.

- ئەلبەرتۆ کاییرۆ دا سیلڤیا: ٢٦ ساڵ دەژی و تەمەن کورتترین کەسایەتیی پێسەوایە، کە ١٨٨٩ لەدایکبووە و زۆربەی ژیانی لە گوند بەسەر بردووە، لە ١٩١٥ بە نەخۆشی سیل دەمرێت. کەم خوێندەواری و گوندی بوونی کاییرۆ، کاریگەری هەبووە لەسەر شیعرەکانی. جارێک ئافرەتێکی خۆشویستووە، بەڵام ئەو گرنگی پێنەداوە.

برناردۆ سواریس: پێسەوا ئەم کەسایەتییە وەک کەسایەتییەکی شێوێنراوی خۆی وەسف دەکات و بە نووسەری (کتێبی نائارامی) دادەنرێت، کە کۆمەڵێک نووسینی کورت و یاداشتی ڕۆژانەن و لە جانتایەکدا بوون و دواتر کۆکراونەتەوە.

پێسەوا جانتایەک پڕ لە خەڵک یاخود باوەڵێک بەجێدەهێڵێت، وەک ئەنتۆنیۆ تابوکی دەڵێت. وەک ئەوەی لای پێسەوا، کەسە دروستکراوەکان، ڕاستەقینەتر بن لە کەسانی ئاسایی. پێسەوا لەو کەسە دەگمەنانەیە، دوور لە نێرجسییەت و عەشقی ناوبانگ، تەنها

دەیویست بۆ خۆی بنووسێت، بۆ خۆی کە بەو هەموو کەسە وەهمیانەی دروستی کردبوون و تێکستیان دەنووسی، ئەدەبێکە بۆ خۆی.

بەرهەمەکانی پێسەوا بۆ چوار بەش پۆلێن دەکرێن:

- ئەو شیعرانەی بەناوی خۆیەوە نووسیونی.

- ئەو شیعرانەی بەناوی کەسایەتی وەهمی و خوڵقێنراوەوە نووسیونی.

- ئەو یاداشتانەی بەدرێژایی ژیانی نووسیونی، بەڵام داویەتییە پاڵ برناردۆ سواریس، کە هەر کەسایەتییەکی وەهمی و دروستکراوی خۆیەتی.

- ژمارەیەکی زۆر لە چیرۆک، لێکۆڵینەوە، وتار، نامە و وەرگێڕان، کە لە زۆر بابەتی فەلسەفی، ئەدەبی، ئابوری و ڕامیاری دواوە و بەناوی کەسایەتی خوڵقێنراو و وەهمییەوە نووسیونی.

پێسەوا لوغزێکە و تا ئێستاش نەتوانراوە، هەموو ئەو کەسایەتیانە بدۆزرێنەوە، کە خوڵقاندونی و وەک دەوترێت، پێسەوا بۆ خۆی ئەدەبێکە.

پێسەوا کەسێک بوو، ئەگەر لەبەر خۆر بوەستایە، ئەوا ٧٢ سێبەری دەبوو.

***

## • ئەلفارۆ دو کامپۆس

ئەلفارۆ دو کامپۆس ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠ لە تاڤیرا لەدایکبووە، کە دەکەوێتە کەنارەکانی ناوچەی ئەلگارڤێ لە پورتوگال. لە شاری گلاسکۆ دبلۆمی لە ئەندازیاریی دەریایی بەدەست هێناوە. لە لیشبۆنە ژیاوە بێئەوەی کار لە بواری پیشەکەی خۆیدا بکات. بە کەشتییەکی زەریای ئەتلەنتیک بڕ سەفەرێک بۆ ڕۆژهەلات دەکات و قەسیدەیەکی کورت بەناوی (ئۆبیاریۆم)ی بۆ دەنووسێت. ئەو سوک و ڕسوا، ئایندەخوازی، پێشڕەو، نهیلیستیی بووە. لە سالی ١٩٢٨دا، جوانترین شیعری سەدەکە (دوکانی توتن) دەنووسێت. لە ژیانیدا خۆشەویستییەکی هۆمۆی هەبووە و بەجۆرێک خۆی لە ژیانی پێسەوا هەڵدەقورتێنێت، کە دەزگیرانییەکەی لەگەڵ ئۆفیلیا تێکدەدات. کامپۆس کەتە و خاوەن قژێکی ڕەشی خاو بووە، بەلادا دایهێناوە، کامڵ و کەمێک لوت بەرز بووە، عەینەکی یەک چاو (مۆنۆکل)ی لە چاو کردووە، ئەمەش شێوەیەکی نمونەیی کەسێکی پێشڕە و بووە لەو سەردەمەدا. ئەو بۆرژوازی بووە و بۆرژوازیش نەبووە، نەرمونیان و قیرسچمەش بووە، هاندەر، عوسابی (Neurosis)و غەمگین بووە. لە ٣٠ی تشرینی دووەمی ١٩٣٥، لە هەمان ڕۆژو ساڵدا لەگەڵ پێسەوادا دەمرێت.

***

- ئەلبەرتۆ کایرۆ

ئەلبەرتۆ کایرۆ دا سیلڤای مامۆستای فێرناندۆ پێسەوا و هەموو ئەلتەرناتیڤەکانییەتی، ساڵی ١٨٨٩ لە لیشبۆنە لەدایکبووە و ساڵی ١٩١٥ لە یەکێک لە هەرێمەکاندا مردووە و وەکو باوکی پێسەوا نەخۆشی سیلی هەبووە. ژیانە کورتەکەی لە گوندێکی ڕیباتیخۆ، لە ماڵی یەکێک لە پوورە قەیرەکانی بەسەر دەبات، کە لەبەر تەندروستییە لاوازەکەی، لای ئەو گۆشەگیر دەبێت. شتێکی ئەوتۆ نییە تا لەبارەی ژیانی ئەم پیاوە گۆشەگیر و ڕاماوەوە بووترێت، کە دوور لە هەموو ژاوەژاوێک ژیا. پێسەوا بە: پیاوێکی قژ زەرد، ڕەنگ بزرکاو، چاو شین، باڵا مامناوەندی وەسفی دەکات. لە ڕووکاردا شیعری پەسنکاری ساکاری نووسیوە، بەڵام لە ڕاستیدا کایرۆ وەک چاوێک بوو بۆ بینین و یەکێک لە پێشەنگانی فینۆمینۆلۆژیایە، کە لە دوای چەند دەیەیەک لە ئەوروپا دەرکەوت.

***

## • ڕیکاردۆ ڕەییس

ڕێکاردۆ ڕەییس لە ١٩ی سێپتەمبەری ١٨٨٧ لە ئۆبۆرتۆ لەدایکبووە و لە قوتابخانەی یەسوعییەکان گەورەبوو. پزیشک بووە، بەڵام نازانین ئەگەر سوودی لە پیشەکەی بینیبێت و لەسەری ژیابێت. دوای دامەزراندنی کۆماری پورتوگال، بەهۆی بیروباوەڕە ئەنارشییەکانی چوو بۆ تاراوگە لە بەرازیل. شاعیرێکی هەستەکی، مادی، نیوکلاسیک بووە و کاریگەر بووە بە والتەر باتەر و کلاسیکی ئەبستراکت و وشک، کە هەندێک لە سروشتییەکان و هەندێک لە پیاوانی زانستی ئەنگلۆ سەکسۆنی لە کۆتایی سەدەکەدا، سەرسام کردبوو.

***

- بێرناردۆ سواریس

مێــژووی لەدایــک بــوون و مردنــی نازانیــن. ژیانێکــی زۆر خاکــی ژیاوە. لـە یەکێـک لـە کۆمپانیاکانـی هێنـان و هەناردەکردنـی قومـاش لـە شـاری لیشـبۆنە (یاریـدەدەری ژمێریـار) بـووە. هەمیشـە خەونـی بـە سـەمەرقەندەوە بینیـوە. ئـەو نووسـەری یاداشـتە ڕۆژانـەی لیریکی و میتافیزیکـی بـووە و نـاوی (کتێبـی نائارامـی) لێنـاوە. پێسـەوا لـە چێشـتخانەیەکی بچـوک بەنـاوی (پێسـەوا) دەیناسـێت و لـە کاتـی شـێو خواردنـدا، بێرنـاردۆ سـواریس باسـی پـرۆژە ئەدەبییەکـەی و هەروەهـا خەونەکانـی خـۆی بـۆ دەکات.

***

## • ئەنتۆنیۆ مۆرا

ئەنتۆنیـۆ مـۆرای فەیلەسـوف، خاوەنـی کتێبـی (گەڕانـەوەی خواوەنـدەکان)ە، کـە دواتـر کتێبـی گـەورەی (نیوپاگانـی)ی پورتوگالـی پێکدەهێنێـت، کۆتایـی ژیانـی لـە کلینیکـی نەخۆشـییە دەروونییـەکان لـە کاسـییە بەسـەر دەبـات. هـەر لـەم کلینیکـەدا پێسـەوا ئەنتۆنیـۆ مـۆرا دەناسـێت. ئەنتۆنیـۆ مـۆرا گـەورە، سـەنگین، خـاوەن دیدێکـی زینـدوو و ڕیشـێکی سـپی بـوو. ئەنتۆنیـۆ مـۆرا سـەرەتای شـیوەنی پرۆمیسـیۆس، کـە لـە ترازیدیـای ئەخیلـەوە وەرگیـراوە، بـۆ پێسـەوا دەخوێنێتـەوە. لـەم دۆخـەدا فەیلەسـوفە پیرەکـە دەستنووسـەکانی بـە پێسـەوا دەسـپێرێت.

***

## • نووسەر

ڕۆماننووسی ئیتالی، ئەنتۆنیۆ تابوکی (٢٣ی ئەیلولی ١٩٤٣- ٢٥ی ئازاری ٢٠١٢) ئەو نووسەرەیە لەناو ئەفسانە و دنیای پێسەوادا کاری کردووە. دیارە تابوکییش، بۆ خۆی چیرۆکێکی سەرسوڕهێنەری هەیە. ئەو کاتێک گەنج دەبێت، لەسەرەتای دەیەی شەستی سەدەی ڕابردوودا، لە فەرەنسا دەخوێنێت، بەڕێکەوت لە کۆشکێکی نزیک ویستگەی شەمەندەفەر، کتێبی (دوکانی تووتن)ی پێسەوا، بە وەرگێڕدراوی فەڕەنسی دەکڕێت، کە ناوی ئەلفارۆ دو کامپۆسی لەسەرە، (ئەمیش یەکێک لە کەسایەتییە دروستکراوەکانی پێسەوایە و پێسەوا بەناوییەوە شیعری نووسیوە). تابوکی لە ڕێگای گەڕانەوەی بەرەو ئیتالیا، دوکانی تووتن دەخوێنێتەوە و ئیدی سەرلەبەری ژیانی دەگۆڕێت. بەوەی ئەو کتێبەی پێسەوا وایلێدەکات خۆی فێری پورتوگالی بکات و لەوێ بخوینێت و ببێتە مامۆستای زمان و ئەدەبی پورتوگالی و یەکێک لە پێسەواناسە گرنگەکان و وەرگێڕی پێسەوا بۆ زمانی ئیتالی.

تا ڕادەیەک دەتوانم بڵێم لەدنیای کوردیدا تابوکی ئامادەیی هەبووە، بەڵام بەوپێیەی دنیای خوێندنەوەی ئێمە (مۆد) زۆر زاڵە بەسەریدا، ئەوا تابوکی زۆر بێدەنگ تێپەڕیوە. ئەگینا تابوکی یەک کتێبی هەیە بەکوردی، کە ئەوەندە بە بێدەنگی تێپەڕیوە،

باوەڕناکەم زۆر کەس هەر ئاگاداریشی بووبێت. ئەو کتێبەش ناوی (خەونی خەونەکان)ە، کە لەلایەن (جەلال ڕەئوف)ەوە ساڵی ۲۰۰۲ کراوە بەکوردی و تابوکی لەو کتێبەدا بیست خەونی ئەندێشەیی، بەناوی بیست ناودارەوە دەگێڕێتەوە، وەک ئەوەی لەبری ئەوان خەون ببینێت، یاخود ببێتە ئەوان. لەوانە: ڕامبۆ، لۆرکا و گۆیای وێنەکێش و... دیارە ئەو یارییەی تابوکی لەم کتێبەدا دەیکات، زۆر جیاوازە لەوەی پێسەوا، ئەگەرچی جوانیی خۆی هەیە و دەتوانرێت هێڵێکی زۆر پەنهان لەنێوان ئەم کتێبەی تابوکی و پێسەوادا بدۆزینەوە. بەوەی ئەگەر پێسەوا دابەش ببێت بەسەر زۆر کەسایەتی وەهمیدا، ئەوا تابوکیش جۆرێک لەم دابەشبوونە دەکات، بەڵام بەسەر کەسانی واقیعی و ڕاستەقینەدا. تابوکی چەندین کتێب و وتاری هەیە، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە پێسەوا وە هەیە. وەک یەکەم ڕۆمانی بەزمانی پورتوگالی (نوێژێک بۆ ئاسودەیی مردوان)، کە دوای مردنەکەی ئەندێشەی بەیەک گەشتنێک دەکات لەگەڵ پێسەوادا. کتێبی (سنوقێک پڕ لە خەڵک)، ڕۆمانی (شەوە هیندییەکان)و ڕۆمانی (وڕێنە- سێ ڕۆژی کۆتایی ژیانی پێسەوا).

ئەو کتێبەی دواییان (ئەم ڕۆمانە وەرگێڕدراوەیە)، ڕۆمانێکی زۆر بچوکی تابوکییە، کە زیاتر بە یاداشتی دوا ڕۆژەکانی پێسەوا دەچێت، (بەڵام یاداشتێکی ئەندێشەیی کە تابوکی دەینووسێتەوە). وەک لە ناونیشانەکەیەوە بەدەردەکەوێت، باسی ئەو سێ ڕۆژەی پێسەوا دەکات، کە نەخۆشە و لە خەستەخانە دەکەوێت. لەو ماوەیەدا پێسەوا لە سەرەمەرگدایە و سێ کەس، لەو کەسایەتییە وەهمییانەی، پێسەوا خۆی خولقاندونی و بەناویانەوە دەقی نووسیوە، هەر جارە و یەکێکیان خۆی دەکات بە ژورەکەیدا و

سەردانی دەکات. هەر یەکێکیش لەو کەسایەتییانە، دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ پێسەوادا و پێکەوە لەبارەی زۆر شتەوە دەدوێن.

پێسەوا کەسێک بوو، کە چوار ژیان، ژیا. ئەویش لە ڕێگای ئەو کەسانەی خولقاندنی. لە ڕۆمانەکەی تابوکیدا و لەکاتی سەرەمەرگەکەیدا، هەموو ئەو ژیانانەی پێسەوا هەیبوون، بەیەک دەگەن و لە دەوری چەرپاکەی کۆدەبنەوە، (کە لەڕاستیدا بوونیان نییە و تەنها لەسەر کاغەز هەبوون)و گفتوگۆ دەکەن، کە پێناچێت لەنێوان وێنەیەکی وەهمی و وێنەیەکی واقیعی و ئەسڵیدا بێت. بەڵکو وەک ئەوەی گفتوگۆکە لەنێوان دوو وێنەی ئەسڵیدا ڕوودەدات.

هەروەها ئەو ڕۆمانە بچوکەی لە چاپە عەرەبییەکەیدا بە (شەوانی هیندی) وەرگێڕدراوە، پەیوەندییەکی قوڵی بەدنیای پێسەوا وە هەیە و نامەوێت لێرەدا هیچی لەبارەوە بڵێم.

***

ئەنتۆنیۆ تابوکی وانەی ئەدەبی پورتوگالی لە زانکۆی (سیینا) دەوتەوە، دوای ئەوەی ساڵانێکی زۆر، وەک بەڕێوبەر لە سەنتەری ڕۆشنبیریی ئیتالی لە پورتوگال کاری کرد. لە ٢٥ی مارسی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کرد.

***

## • وێنەکێش

سکێچەکانی فێرناندۆ پێسەوا، کە لەم کتێبەدان، بەشێک لە زنجیرەیەک پێکدەهێنن، کە ٢٢٣ وێنەن و (خۆلیۆ پومار) کێشاونی. ئەم کارانەشی بۆ ئەوە کرد، تا (ئەزۆلیخۆس) لە وێستگەی ئەلتو دۆس مۆینۆس لە میترۆی بەرشەلۆنە برازێننەوە. ئەم کارانەش پێشکەش بە چوار شاعیر کراون: کامۆییس، پۆکاچ، ئەلمادا و پێسەوا. ئەم وێنانەش هەر هەموویان، ساڵی ١٩٩٣ لە ئەلبومێکدا چاپکرانەوە و کۆمپانیای (مێترۆپۆلیتانۆ لیشبۆنە) بڵاوی کردەوە.

خۆلیۆ پومار ساڵی ١٩٢٦ لە لیشبۆنە لەدایکبووە و لەنێوان لیشبۆنە و پاریس دەژی و کار دەکات.

چەندین پێشانگای لە پاریس، لیشبۆنە، بەرازیل و ئەڵمانیا کردۆتەوە. چەند کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە، لەوانە:

* گوتار لەبارەی عەجزی هونەرمەندەوە ١٩٨٤.
* ئەلگۆگس ئەفینتوس- شیعر ١٩٩٢.

***

